## إسماعيل راجى الفاروقى

یەکێکە لە هەرە بەناوبانگترینی ئەو بیرمەندو پسپۆڕو شارەزایانە کە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام و ئایینەکان لە جیهاندا کردووە، لە فەلەستین لە دایکبووە، بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری فەلسەفە لە زانکۆی (إندیانا) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەدەستهێناوە، لە (پەیمانگای ناوەندی توێژینەوە ئیسلامیەکان) لە پاکستان، لە زانکۆی (سیراکیوز)ی ئەمەریکی و لە زانکۆی (ماکجیل)ی کەنەدی وانەی وتوەتەوە، سەرۆکی (کۆلیژی ئیسلامی ئەمەریکی)بووە لە شیکاغۆ، مامۆستای بەشی ئایین بووە لە زانکۆی (تیمبل) لە بەنسلفانیا لە ئەمەریکا، ژمارەیەکی زۆر کتێب و توێژینەوەی بەتەنها یان بەهاوکاری کەسانی تر نوسیوە، لە نێویاندا (ئەتڵەسی مێژوویی بۆ ئایینەکانی جیهان)، وە (ئایینە گەورەکان لە ئاسیا )، (یەکتاپەرستیی)، بەشداربووە لە دامەزراندنی پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی)داو یەکەمین سەرۆکی ئەو پەیمانگایە بووە.

نوسینی: إسماعیل راجی الفاروقی
وەرگێڕانی: محەمەد مەحەمەد حەمەمیرزا



# یەکتاپەرستیی و مرۆڤناسیی

## لە هزری ئیسماعیل فاروقییدا

لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ
لێکۆڵینەوەی فیکریی (٤٠)

# یەکتاپەرستیی و مرۆڤناسیی
# لە هزری ئیسماعیل فاروقییدا

نوسینی: إسماعیل راجي الفاروقي
وەرگێڕانی: محەمەد محەمەد حەمەمیرزا

# یەکتاپەرستیی و مرۆڤناسیی
# لە هزری ئیسماعیل فاروقییدا

......................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٤٠)

- نووسینی: إسماعیل راجی الفاروقی
- وەرگێڕانی: محەمەد محەمەد حەمەمیرزا
- بابەت: فکری
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپی یەکەم: چاپخانەی شڤان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٣٨٥)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە

# ناوەرۆك

# تێبینیەکی گرنگ

ئەم نامیلکەیە لە دوو بابەت پێك هاتووە:

**یەکەم:** (یەکتاپەرستی کرۆکی ژیاری ئیسلامییە) ئەم بابەتە نووسەر بە زمانی عەرەبی نووسیویەتی و پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی بەچاپی گەیاندووە.

**دووەم:** (تیۆری مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزدا) ئەم بابەتەیان پرۆفیسۆر ئیسماعیل فاروقی لە کۆنگرەیەکدا لە تارانی پایتەختی ئێران پێشکەشی کردووە وەك توێژینەوەیەکی زانستی.

بەپێویستمان زانی ئەم دووبابەتە بەیەکەوە وەربگێڕین و بەچاپی بگەیەنین بەزمانی شیرینی کوردی، لەژێر ناونیشانی (**یەکتاپەرستیی و مرۆڤناسیی لە هزری ئیسماعیل فاروقییدا**) تا خوێنەری کورد لێیان بەهرەمەند ببن.

# بابەتی یەکەم
# یەکتاپەرستی کرۆکی ژیاری ئیسلامییە

**پێشەکی:**

گومانی تێدانیە کە کرۆکی ژیاری ئیسلامی بریتیە لە خودی ئیسلام، کرۆکی ئیسلامیش یەکتاپەرستییە، واتە بوونی باوەڕێکی قووڵ و پاك و بێگەرد بە خوای گەورە کە تاکە بەدیهێنەری ڕەهای باڵادەستە، پەروەردگاری تەواوی بونەوەرەکانەو سەرداریانە.

ئەم دوو پڕەنسیپە سەرەکییەش بەڕوونی دیارن، هەرکەس سەر بەو ژیارە بێت و لایەنداروو پشکدار بێت تیایدا هەرگیز گومانی لە ڕاستێتی ئەو دوو پڕەنسیپە نیە. ئەم دوو پڕەنسیپە بە هیچ جۆر نەکەوتوونەتە بەر هیچ جۆرە گومان و دوودڵییەك جگە لەلای بزووتنەوەکانی بە گاورکردن یان خۆرهەڵاتناسان و کەسانیتریش کە لە ڕابردوویەکی نزیکدا هاتوون و راڤەی ئیسلامیان کردووە، موسڵمانانیش ئیتر رادەی رۆشنبیریان لە هەر ئاستێکدا بێت هەر لەسەر ئەو بڕوا و متمانە رەهایەن کە ژیاری ئیسلامی کرۆکێکی هەیە، ئەو کرۆکەش شیاوی پێ

شارەزابوون و شیکارکردن و وەسفکردنە، ئەویش کرۆکی یەکتاپەرستییە[1]، شیکارکردنی ئەو یەکتاپەرستیەش بەو سیفەتەی کە کرۆك و پرەنسیپێکی سەرەکییە لە ژیاری ئیسلامیدا ئەوا بووەتە بابەتی ئەم نامیلکەیە.

یەکتاپەرستیی ئەو پرەنسیپەیە کە ناسنامە بە ژیاری ئیسلامی دەبەخشێ، وە هەموو پێکهێنەرەکانی دەبەستێت بەیەکەوە تا بیکاتە بونەوەرێکی ئەندامیی کاملْ و ئەوکات پێی دەڵێین ژیار، جا لە پێکەوەبەستنی توخمە جۆراوجۆرو پرژوبڵاوەکان بەیەك، کرۆکی ژیارەکە - کە لەو حاڵەتەدا بریتیە لە یەکتاپەرستیی - هەڵدەستێ بەرەنگپۆش کردنی ئەو توخمانە بە رەنگی تایبەتی خۆیەوە، پاشان ئەو کرۆکە سەرلەنوێ هەڵدەستێ بە پێکهێنانەوەی بەجۆرێ کە گونجاوبێت لەگەڵ توخمەکانی ترداو پشتگیرکار بێت لێیان.

هیج مەرج نیەو پێویستیش نیە ئەم کرۆکە هەستێ بە گۆڕینی سروشتی ئەو توخمانە، بەڵکو هەرئەوەیە دەیانگوێزێتەوە تا ژیارێکیان لێ دروستبکات و ئەو سیفەتە نوێیانەی خۆی کە ئەو ژیارەیان لێ پێکهێنراوە ببەخشێ بەو توخمانە. مەوداو ئاستی گۆڕینەکەش جیاوازەو لەنێوان گۆڕینێکی کەم و ریشەییدایە، ئەوەش بە پشت بەستن بە مەوداو ئاستی پەیوەندی ژیارەکە بە توخمە جۆراوجۆرەکان و کارو

---

[1] - بڕوانرێتە وەڵامی نوسەر لەسەر ئەو خۆرهەڵاتناسانەی کە دەربارەی هەبوونی کرۆك لە ئیسلامدا گومان دەوروژێنن ، یان ئەو کرۆکە ناسراوە یان لەتوانادایە شارەزایی لەسەری پەیدابکرێ. ئەویش لەبابەتێکدا بەناوی (کرۆکی شارەزایی ئایینی لە ئیسلامدا).

ئەرکیانەوە، ئەم پەیوەندیەش لە زەینی ئەو موسڵمانانەدا کە بەدواداچوونیان بۆ ڕواڵەتەکانی ئەم ژیارە دەکرد بەزەقی دەرکەوت. لێرەوە چەمکی یەکتاپەرستیان کردە ناونیشانی گرنگترینی توێژینەوەکانیان، وە تەواوی بابەتەکانی تریان خستە ژێر ئاڵای یەکتاپەرستییەوە. یەکتاپەرستیان دانا بە گرنگترینی پڕەنسیپە سەرەکیەکان کە هەموو پڕەنسیپەکانی تر لەخۆدەگرێ یان حوکمیان تێدا دەکات. هەروەها ئەو سەرچاوە سەرەکییەو ئەو چاوگە سەرەتاییەیان تێدا دییەوە کە حوکمی هەموو رواڵەتەکانی ژیاری ئیسلامی دەکات.

پێناسەی یەکتاپەرستیش بەیەك دەستەواژەی سانای دەماودەم بۆماوە بریتیە لە باوەڕو شایەتیدان کە جگە لەخوا هیچ خوایەکی تر بوونی نیە (لا إله إلاّ الله)، ئەم گوتەیەش بەشێوەی نێگەتیف هاتووە، زۆر پوخت و تەواو کورتە، ئەم گوتەیە گەورەترینی هەموو ماناکان و دەوڵەمەندترینیان هەڵدەگرێ، لە یەك ڕستەشدا چڕدەبێتەوە کە کەلتورێکی کامڵ یان ژیارێکی کامڵە یان سەراپای مێژووە. ئەم دووپات کردنەوەیەش لە یەك وشە یان لە یەك شایەتیدان لە ئیسلامدا دەیبینینەوە، لێرەوە ئیتر هەر هەموو ئەو فرەجۆریی و دەوڵەمەندیی و مێژوو و رۆشنبیریی‌و شارەزایی و دانایی‌و ژیارەی کە هەن لە ڕستەیەکی زۆر کورتدا کۆدەبنەوە ئەویش (لا إله إلا الله)یە.

# یەکتا پەرستیی بەو سیفەتە
# کە تێڕوانینێکە راڤەی جیهان دەکات

یەکتاپەرستیی تێڕوانینێکی گشتگیرە بۆ واقیع و بۆ ڕاستێتی و بۆ جیهان و بۆ کات و شوێن و بۆ مێژووی مرۆییە، بەم واتایەش ئەوا ئەم پرەنسیپانە لە خۆدەگرێ:

**١ ـ دوالیزمەیی:**

واقیع دوو ڕەگەزی لەیەك جیایە، خوای گەورە و غەیری خوا، بەدیهێنەرو بەدیهێنراو، لە پلەی یەکەمدا جگە لەیەك تاك و بەس هیجێکیتر بوونی نیە ئەویش خوای گەورەی رەهاو بەتوانایە، هەر خۆی خوایەو بەس، ئەزەلی و و بالأدەستە، هیچ لە وێنەی نیە، هەتا هەتایە هەیەو هەر دەمێنێ، تاکێکی رەهایە هاوبەش و یاریدەدەری نەبووەو نیە، لە پلەی دووەمیشدا هەریەك لە شوێن — کات، جیهان، بونەوەری بەدیهێنراو بوونیان هەیە کە هەموو دروستکراوەکان و جیهانی شتەکان و رووەك و گیاندارو مرۆڤ و جنۆکەو فریشتەو ئاسمانەکان و زەوی و بەهەشت و دۆزەخ لە خۆدەگرێ. وە هەرچیەکی تریش بێتە نێو بوونەوە هەر لە ساتی یەکەمەوە تا کۆتایی ئەوا هەموو ئەوانەی تریش لەخۆدەگرێ، وە هەردوو پلەکەش: لە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو لە رووی سروشتی بوونیانەوە هەروەها لە رووی پێکهاتەو رێڕەویانەوە، هەتا

**ئەوپەڕی جیاوازن لە یەکتری، تەواو مەحاڵە کە یەکێکیان لەگەڵ ئەویتریاندا یەکبگرێ، یان بتوێتەوە یان بچێتە نێو ئەویتریان یان بڵاوە بکات لە نێویدا. هەرگیری نەکراوەو ناکرێ بەدیهێنەر بگۆدڕێ و ببێتە بەدیهێنراو، بەهەمانشێوەش ناکرێ بەدیهێنراو بە هەرشێوەو بە هەر مانایەك بەرەو شکۆمەندی بڕوا و بگۆڕدرێ و ببێتە بەدیهێنەر[1].**

---

[1]- لەم پێگەیەوە دەڵێین یەکتاپەرستیی جیاوازە لە سۆفیگەرێتی، هەروەها لەچەند تاقمێکی هیندۆسی، کە حەقیقەتی جیهان لە خوادا دەتوێتەوە، خوای گەورەش دەبێتە تاکە حەقیقەت و تاك هەبوو، لەم تێڕوانینەشدا هیچ شتێك بوونی نیە جگە لەخوا، هەموو شتێکیتر (گومان و خەیاڵە) و حەقیقەتێکی نیە، هەروەها ڕای میسریە دێرینەکان و ئەغریق و تاوییەکان دژە لەگەڵ چەمکی یەکتاپەرستیدا ، ئەگەرچی ئەمیش بەتەواوتی دژە لەگەڵ ڕای هیندۆسیەکان، لە هەموو ئەم ڕایانەدا ئەوە دەخوێنرێتەوە کە بوونی بەدیهێنەر لەنێو بەدیهێنراودا یان لە جیهاندا دەتوێتەوە. جا ئەگەر میسر وای بینیوە کە فیرعەون لەڕاستیدا خوایە ، هەروەها چووزەی گیای سەوزە کە لە زەوییەوە دێتەدەر لە بەهاردا، وە ڕووباری نیل بە ئاوو بە بنەکەیەوە، وە پەپکەی خۆر بە گەرماییو بە رووناکیەکەیەوە، ئەوا کەلەپووری ئەغریقی– ڕۆمی وادەبینێ کە خوا بریتیە لە هەر ڕواڵەتێك لە ڕواڵەتەکانی سروشتی مرۆیی یان کەسێتی، گەورەو گەورە دەبێ تا پلەیەك کە بە مانایەکی دیاریکراو دەیخاتە سەرووی سروشتەوە بەڵام هەر بەمانایەکیتر لە سروشتدا دەیهێڵێتەوە. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا بەدیهێنەر لەگەڵ بەدیهێنراوەکەیدا دەتوێنەوە لە یەکدا، وە بە کاریگەری قەشەکان مەسیحیەت خۆی لە یەکتاپەرستی جیاکردەوە کاتێ لەخۆڕا ئیدیعای کرد کە خوای گەورە خۆی بەرجەستە کردووە لە جەستەی مەسیحدا، وە بانگەشەی کرد کە مەسیح خوایە، بەڵام تایبەتمەندی جیاکەرەوەی ئیسلام ئەوەیە کە جەختدەکاتەوە لەسەر دوالیزمەیی رەهاو بوونی جیاوازی تەواو لەنێوان خواو جیهاندا، لە نێوان بەدیهێنەرو بەدیهێنراودا. جا بەم هەڵوێستە روونەو جیددیەو بێکەمتەرخەمیە دەربارەی مەسەلەی شکۆمەندیی خوایی ئەوا ئیسلام بووەتە پوختەی میراتی شکۆداری پێغەمبەرایەتیو ئەو ناوەندە ئاڵتونیە پڕدەکاتەوە واتە لەنێوان زیادەڕۆیی خۆرهەلآت (هیند) کە نکولی لە

### ١ - پەی پێبردن:

پەیوەندی لەنێوان دوو پلەکەی واقیعدا بە سروشتی خۆی پرەنسیپێکی پەی پێبردنە، پەی پێبردنیش لە مرۆڤدا پەیوەستە بە توانایی تێگەیشتنەوە، بەو سیفەتە کە هۆکارە بۆ شارەزابوون و سایەیە بۆی، تێگەیشتن هەموو ئەرکەکانی شارەزابوون (**معرفة**) دەگرێتەوە هەر لە یادەوەری و خەیاڵکردن و بیرکردنەوەو سەرنجدان و هەڵهێنان و لەخۆگرتن و تا هەرشتێکی تریش کەبۆ ئەو مەبەستە سەر بکێشێ، بەهرەی تێگەیشتن لە هەموو مرۆڤەکاندا بوونی هەیە، ئەو بەهرەیەش ئەوەندە بەهێزە کە تێگەیشتن لە ئیرادەی خوای گەورە بە یەکێك لەو دوو رێگایە یان بە هەردووکیان دەبێ: واتە کاتێ کە گوزارشت لێکردنی بەچەند وشەیەکی راستەوخۆ دەبێ لە خواوە بۆ مرۆڤ، یان کاتێك ئیرادەی خوایەتی لە رێگای سەرنجدان لە بەدیهێنراوەکان جیلوە دەدات[١].

---

سروشت دەکات و نێوان زیادەڕۆیی خۆرئاواو (ئەغریق و میسریەکان) کە نکولی دەکەن خوا ئەوێکیتر بێت.

[1]- ئەم پرەنسیپە ئاماژە دەدات بۆ رەهایی جیابوونەوەی بوون لەنێوان خواو مرۆڤدا، وە بۆ مەحاڵی یەکگرتنەوەیان لە دووتوێی بەرجەستەبوون یان بەخواکردن یان توانەوەدا، بەڵام پرەنسیپەکە نکولی لەوە ناکات کە دەکرێ پەیوەندی لەنێوانیاندا هەبێت و بگەن بەیەك، لە واقیعیشدا لە گەیاندنی فەرمانێك لە خواوە بۆ مرۆڤ کە چاوەڕێی لێدەکرێ گوێڕایەڵی لێبکات جیانابێتەوە لە پێغەمبەرایەتی. هەروەها توانایی گەیشتن بەیەك لە رێگای ئەقڵ یان هەڵهێنانەوە رەتناکاتەوە. دەکرێ کاتێ ئەم بەیەکگەیشتنە رووبدات کە مرۆڤ چاودێری

### ٣ ـ مەبەستداریی:

سروشتی بونەوەر وەهایە کە خۆی لەخۆیدا مەبەستدارە، واتە بۆ مەبەستێك دروستکراوە، خزمەت بە مەبەستێکی بەدیهێنەرەکەی دەکات، بە مەبەست و بە نیەتێکەوە هەڵدەستێ بەم کارە، ئەم جیهانە هەروا بە بێهودەو بۆ گاڵتەو گەپ بە دینەهێنراوە[١]، ئەوە کارێکی بە رێکەوت و لەپڕو لابەلا نیە، لەڕاستیدا جیهان لە کامڵترین شێوەو دیمەندا بەدیهێنراوە، هەر هەموو ئەوەی کە هەیەو بوونی هەیە بە رێژەو رادەیەکی دیاریکراو هێنراوەتە بوون بە جۆرێ کە گونجاو بێت لە گەڵیدا وە مەبەستێکی گەردوونی دیاریکراو جێبەجێ دەکات[٢]. لەڕاستیشدا جیهان (بونەوەرە) واتە بەدیهێنراوێکی رێك و پێکە، (ئاژاوە و پشێوی)

---

بەدیهێنراوەکان دەکات، وە تێڕامانی دەبێ لە چونێتی و بۆچییەتی حاڵەتەکە کە ئیتر ئەو دەرئەنجامەی دەستدەکەوێت کە دەبێ دروستکارو کاربەڕێکەرو رزق دەرێکیان هەبێت کە شایەنی گرنگی پێدانە. ئەمەش لە ڕێگای پەی پێبردن و ئەقڵگەراییەوەیە، لە کۆتا شیکاریشدا ئەم پرەنسیپی جیاکردنەوەی هەبوویە لە نێوان خواو جیهاندایە کە یەکتاپەرستی جیادەکاتەوە لە هەموو ئەو تیۆرانەی کە مرۆڤ دەکەنە خوا یان خوا دەکەنە مرۆڤ. ئیتر ئەمە لەلای ئەغریقیەکان یان رۆمان یان هیندۆس یان بوزییەکان یان مەسیحیەکان بێت چون یەکە.

[1]- هەروەك لە سورەتی ال عمران: ئایەتی (١٩١)، سورەتی **المؤمنون**: ئایەتی (١١٦)دا دەیخوێنینەوە.

[2]– هەروەك لە سورەتی **الأعراف**: ئایەتی (١٥)، سورەتی یونس: ئایەتی (٥)، سورەتی الرعد: ئایەتی (٩)، سورەتی الحجر: ئایەتی (٢٩)، سورەتی الفرقان: ئایەتی (٢)، سورەتی السجدة: ئایەتی (٩)، سورەتی ص: ئایەتی(٧٢)، سورەتی فصلت: ئایەتی (١٠)، سورەتی القمر : ئایەتی (٤٩)، سورەتی **الطلاق**: ئایەتی (٣)، سورەتی القیامة: ئایەتی (٤ ، ٣٨)، سورتی عبس: ئایەتی (١٩)، سورەتی **الانفطار**: ئایەتی (٧)، سورەتی **الأعلی**: ئایەتی (٢–٣)دا هاتووە.

نیه، بەردەوام ویستی خوای گەورە لەم بونەوەرەدا جێبەجێ دەبێت، هەروەها لە دووتوێی یاسای زۆرەملێی سروشتیدا رێکخستنەکەی جێبەجێ دەبێت، چونکە ئەم رێك و پێکیانە لەنێو خودی سروشتی شتەکان خۆیاندایە. جگە لە مرۆڤیش ئیتر هیچ بەدیهێنراوێکیتر نیە کە کاریکات یان بەرێگایەك هەبوونی ببێ بە غەیری رێگایەك کە خوای گەورە بۆی دیاریکردووە[1].

مرۆڤ ئەو تاکە دروستکراوەیە کە بەبێ زۆرەملێ و بەبێ زۆر پێکردن ویستی خوای گەورەی تێدا جێبەجێ دەبێت، بەڵکو بە رەزامەندی خودی مرۆڤ خۆیەتی، بەم پێیەش تەواوی ئەرکە جەستەییو دەروونیەکان لە مرۆڤدا تەواوکەری سروشتن، بەم واتایەش ئەوا دەچێتە ژێر هەمان ئەو یاسا زۆرەملێیانەوە کە هەموو بەدیهێنراوەکانیتر دەچنەژێری و ملکەچن، بەڵام ئەرکە رۆحیەکان، وەك تێگەیشتن و کرداری رەوشتی ئەوا دەکەونە دەرەوەی سنوری سروشتی دیاریکراو، بەڵکو ئەم ئەرکانە پشت لەسەر خاوەنەکەیان دەبەستن و شوێن کەوتەی هەر بڕیارێکی ئەو کەسەن، بەجێگەیاندنی ویستی خوای گەورە لە لایەنە رۆحیەکاندا بەهایەکی جۆریی جیاوازی هەیە لەو ویستە خواییە کە بە زۆرەملێ لە بەدیهێنراوەکانی تردا جێبەجێ دەبێت. چونکە جێبەجێبوونی زۆرەملێ تەنها بەسەر بەهای توخمە ماددی یان بەها سودمەندەکاندا دەچەسپێ و بەس، لە بەرانبەریشەوە ئەرکی بە ئازادی

---

[1]- سورەتی الاسراء: ئایەتی (٧٧)، سورەتی **الأحزاب**: ئایەتی (٦٢)، سورەتی **فاطر**: ئایـەتی (٤٣)، سورەتی الفتح: ئایەتی (٢٣)، سورەتی **الطلاق**: ئایەتی (٣).

راپەڕێنراو بەسەر بەها رەوشتیەکاندا دەچەسپێ: جا وێڕای ئەوە کە مەبەستە رەوشتیەکانی خوای گەورەو فەرمانەکانی بۆ مرۆڤ لە جیهانی هەستپێکراو و بینراودا بناغەیەکیان هەیە، بەو هۆیەوە کە لایەنێکی سودمەندییان تێدایە، بەڵام ئەم لایەنە هیچ جۆرە سیفەتێکی جیاکاریان پێنابەخشێ، واتە هەر بەوەی کە رەوشتی بن، چونکە لەڕاستیدا ئەو فەرمانانەی خوای گەورە لەو جۆرەن کە دەگونجێ بە ئازادی جێبەجێ بکرێن، واتە بوونی توانای دەرچوون لێیان ئاسان بێت ، ئەم حاڵەتەش دەقاو دەق ئەو ئازادیەیە کە هەیبەت و ویقار بۆ شتە رەوشتیەکان فەراهەم دێنێ و پەردەی ویقار دەدات بە سەریاندا [١] .

## ٤ ـ توانایی مرۆڤ و ملکەچییەتی سروشت:

بەو پێیە کە هەرشتێك بۆ مەبەستێك دروستکراوە ـ بە سەراپای بوونیشەوە ـ ئەوا دەبێ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە بکەوێتە نێو زمکانەوە [٢]، بە غەیری ئەم راستییە ئیتر هەر دەبێ گومان پێبردن جێگای

---

[1] - هەر کارێك (کە سروشت پێی هەڵبستێ) ئەوا بە تەبیعەتی خۆی پەیوەست نیە بە رەوشتەوە، شایانی هیچ جۆرە پاداشت یان سزایەك نیە، وەك هەناسەدان یان هەرسکردن، یان کارێکی چاکە وە یان ستەمێك لەژێر زەبرو زەنگدا ئەنجامبدرێن، تەواو بە پێچەوانەی ئەمەشەوە ئەوا هەر کارێك بە ئازادی ئەنجامبدرێ، لەگەڵ ئەگەری هەستانی بکەرەکەی بە ئەنجامدانی یان ئەنجامنەدانی، وە یان هەستێ بە کارێکی تریش بە تەنیشتی ئەوەوە ئەوا شایانی پاداشت یان سزایە.

[2] - ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کە باس لە کەماڵی دروستکراوەکانی خوای گەورە دەکەن ئەم گوتەیە پشتڕاست دەکەنەوە، (بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١، ٢) ل/ ٥) هەروەها ئەو ئایەتانەی کە جەخت لەسەر پابەندبوونی رەوشتی مرۆیی و بەرپرسێتیەکەی دەکەنەوە ، ئاماژەکردن بۆ ئەو بەرپرسێتیە لە ئایەتی زۆردا هاتوون و زەحمەتە بژمێردرێن.

**خۆی بکاتەوە، بەم پێیەش ئەوا خودی دروستکراوەکان و ڕێرەوی زمکانی حیسابی نەبوویان بۆ دەکرێ و هیچ ماناو ناوەڕۆکێکیان بۆ نامێنێتەوە، بە غەیری ئەمەش واتە کەوتنە نێو زمکان ئەوا (ئەرك پێسپاردن) یان (پابەندبوونی ڕەوشتی) دادەڕوخێ، بەم داڕوخانەش مەبەستی خوای گەورە یان تواناکەی تێکدەشکێ. بۆیە جێبەجێکردنی ڕەهایی، واتە هۆکاری خوایی بۆ دروستکراو دەبێ بکەوێتە نێو کایەی مێژووەوە، واتە بکەوێتە نێو سنوری ڕێرەوی کات لەنێوان دروستکراو و ڕۆژی لێپرسینەوە. مرۆڤیش بەو سیفەتە کە خاوەنی کردەی ڕەوشتیە، دەبێ تونایی هەبێت لەسەر گۆڕینی خۆی و مرۆڤە هاوشێوەکانی، واتە کۆمەڵگا، سروشت، واتە دەوروبەرەکەی، بۆ ئەوەی ڕێك و پێکییەکە، یان فەرمانی خوایی لە خودی خۆیداو بە هەمانشێوەش لە هەموو ئەو شتانەی تریشدا جێبەجێ ببێت[1]. مرۆڤیش بەو سیفەتە کە ئامانجی کردەی ڕەوشتییە، ئەوا بەو سیفەتەی کە بکەرو کارایە دەبێ خۆی و هاوتاو هاوەڵەکانی و دەوروبەرەکەی تواناییان هەبێ لەسەر وەرگرتنی کرداری کاریگەرانەی مرۆڤ، ئەم توانایەش ڕەنگدەرەوەی توانای ڕەوشتی مرۆڤە لەسەر کردار، چونکە مرۆڤ بکەرە، بە غەیری ئەمەش ئەوا توانایی مرۆڤ لەسەر کرداری ڕەوشتی دەبێتە شتێکی مەحاڵ، دواجاریش سروشتی مەبەستداریی لە بوونەوەردا دادەڕوخێ، جارێکی تریش ئەوا شتێك**

[1]- ئەم  مانایەیەش  لەو ئایەتانەدایە کـە ئامـاژە دەدەن بـۆ ملکەچـبوونی دروسـتکراوەکان بـۆ مرۆڤ وەك: سورەتی الرعد: ئایەتی (٢)، سورەتی إبراهیم: ئایەتی (٣٢– ٣٣)، سـورەتی النحـل: (١٢–١٤)، سـورەتی الحـج: ئایــەتی (٣٦– ٣٧ و ٦٥)، سـورەتی العنکبـوت: ئایــەتی (٦١)، سورەتی لقمان: ئایەتی (٢٠، ٢٩)، سورەتی **فاطر**: ئایەتی (١٣)، سـورەتی ص: ئایـەتی (١٨)، سورەتی الزمر: ئایەتی (٥)، الزخرف: ئایەتی (١٣)، سورەتی **الجاثیة: ئایەتی** (١١- ١٢).

نامێنێتەوە ڕێ بدات بە قورتاربوون لە گومانبردن، جا بۆئەوەی دروستکراو مەبەستێکی هەبێت ـ ئەمەش گریمانەیەکی زەرووریە کاتێ دەوترێ خوا خوایەو کردەوەشی شتێکی بێهودە نیە ـ ئیتر دەبێ دروستکراو ملکەچ بێت، شیاو بێت بۆ وەرچەرخان گۆڕان و توانایی هەبێت لەسەر گۆڕینی کرۆکی خۆیو پێکهاتەو بارو پەیوەندییەکانی خۆی، بۆئەوەی ئاڕاستەی ڕێك و پێکی یان ئامانجی مرۆیی بەرجەستە بکات یان بیکاتە شتێکی دیارو لەبەرچاو، ئەم کردارەش ڕاست دەچەسپێ بەسەر تەواوی دروستکراوەکان و لە نێویشیاندا سروشتی جەستەیی و دەروونی و ڕۆحی مرۆڤ، هەموو دروستکراوەکان تواناییان هەیە لەسەر جێبەجێکردنی ئەو شتەی کە هەر دەبێت ببێت، واتە ویستی خوای گەورە یان تەواوی ڕێك و پێکییەکەی لەوکات و لەو شوێنەدا کە دیاری کردووە[1].

### ٥ ـ بەرپرسێتی و لێپێچینەوە:

ئەگەر مرۆڤ ئەرکی پابەندبوون بە گۆڕینی خودی خۆی و کۆمەڵگاکەی و دەوروبەرەکەیی لەئەستۆدا بێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاڕاستە ڕێك وپێکە خواییەکەدا بگونجێ و ڕێ بکات، وە لە توانایشیدا بێت کە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات، وە ئەگەر هەموو ئامانجێك لە کرداریدا بە ویستی خۆی بێت و توانای وەرگرتنی ئەو کارەی هەبێت و ئامانجەکەی بەرجەستە بکات تێیدا، ئەوا ئەمە ئەو ئەنجامەمان دەستدەخات کە دەبێ مرۆڤ بە زۆرەملێ بەرپرس بێت، وە بەبێ بەرپرسێتی یان لێپێچینەوە ئەوا هەر پابەندبوونێکی

---

[1]- هەروەك لە چەندین شوێن لە قورئانی پیرۆزدا جەختکراوەتەوە لەسەر پابەندبوونی ڕەوشتیی.

**ڕەوشتیش مەحاڵە. جا ئەگەر مرۆڤ بەرپرس نەبووایەو لەسەر کردەوەکانی لێپێچینەوەی لەگەڵدا نەکرایە، ئەوا گومانبردن دەبووە ئەو شتە کە هەردەبوو ببووایە.**

**جارێکی تریش دەڵێین، کەواتە لێپێچینەوە یان جێبەجێکردنی بەرپرسێتی، مەرجێکی پێویستە بۆ پابەندبوون بە ڕەوشت و چوونەژێر بە ڕەوشتیی بوون، ئەمەش لەخودی سروشتی (پێوانەیی)[1]ەوە دەردەچێت، گرنگیش نیە ئەو لێپێچینەوە لە شوێن ـ کاتێك دا یان لە کۆتای یەکێکیاندا یان هەردووکیاندا ڕاپەڕێنرێ، بەڵام هەر دەبێ ئەو لێپێچینەوەیە بکرێت، گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورە، واتە هەستان بەوەی کە فەرمانی پێکردووەو جێبەجێکردنی ئاڕاستە ڕێك و پێکەکەی ئەوە، واتە گەیشتنە بە سەرفرازی و ڕزگاربوون و بەختەوەریی و ئاسودەیی، بە پێچەوانەی ئەمەیشەوە واتە بە سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی ئەوا سزا و مەینەتی و زەحمەت و نەگبەتی و ئازارەکانی دۆڕاندن و شکستخواردوویی بەدوای خۆیدا دێنێ.**

[1]- ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کە باس لە ڕۆژی لێپێچینەوە دەکەن زۆرن و پێویست ناکات هەموویان بهێنین. لێرەدا تەنها ئاماژە بە چەند دانەیەکیان دەکەین: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾ **القيامة**: ٣٦، ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾ **الغاشية**: ٢٦، ﴿ يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴾ **النساء**: ٨٥.

## یەکتا پەرستیی بەو سیفەتە کە کرۆکی ژیارەکەیە

**یەکتاپەرستیی بەو سیفەتە کە کرۆکی ژیاری ئیسلامیەیە،** دوو لایەن یان دوو ڕەهەندی هەیە: میتۆدو ناوەڕۆك. لایەنی یەکەم واتە میتۆد شێوەکانی پڕاکتیزەکردن و بەگەڕخستنی پڕەنسیپە (سەرەتاییەکانی) ژیارەکە دیاری دەکات، لایەنی دووەمیش واتە ناوەڕۆك هەمان ئەو پڕەنسیپە سەرەتاییانە دیاریدەکات.

### یەکەم: لایەنی میتۆد:

ئەم لایەنە سێ بنەما لەخۆدەگرێ کە بریتین لە: یەکبوون، ئەقلگەرایی ، لێبوردەیی. ئەم سێ بنەمایەش شێوەی ژیاری ئیسلامی دیاری دەکەن، کە لە هەر جومگەیەك لە جومگەکانی ئەم ژیارەدا بڵاوبوونەتەوە.

### ١ ـ یەکبوون:

بەبێ یەکبوون هیچ ژیارێك بوونی نیە، ئەگەر ئەو توخمانەی کە ژیارێك پێکدەهێنن یەکنەگرن و پێکەوە گرێ نەدرێن و لەگەڵ یەکتردا ڕێکنەخرێن ئەوا ژیارەکە پێك ناهێنن، بەڵکو لەو حاڵەتەدا دەبنە تێکەڵەیەکی لەسەر یەك کەڵەکە بوو، کەواتە پێویستە پڕەنسیپێك هەبێ هەموو ئەو ڕەگەزە جۆراوجۆرانە یەکبخات و بیانخاتە چوارچێوەی خۆیەوە، ئەم پڕەنسیپە ئەو پەیوەندییە تێکەڵەیەی کە لەنێوان

توخمەکاندا هەیە دەگوێزێتەوە بۆ پێکهاتە (بونیاد)یەکی ڕێك وپێك کە پلەی باشترین یان پلەی گرنگی پێدانیان تێدایەو پێیانەوە جیادەکرێتەوە. ژیاری ئیسلام هەڵدەستێ بە دانانی توخمەکانی لەنێو یەك پێکهاتە (بونیاد)یەکی ڕێك وپێکداو کە بەپێی ئاڕاستەیەکی ڕێك وپێك هەبوون و پەیوەندییەکانی دیاریدەکات، دەکرێ ئەو توخمانەش لەخۆیاندا لە سەرچاوەیەکی ناوخۆیی یان دەرەکییەوە هاتبن، واقیعیش سەلماندویەتی کە ژیارێك نیە هەندێ توخمی ناوخۆی لە شوێنی ترەوە وەرنەگرتبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو ژیارە بتوانێ هەستێت بە هەرسکردنی ئەو توخمانە، واتە سەر لەنوێ پێکهێنانەوەی شێوەو پەیوەندییان تا لە سیستمی تایبەتی خۆیدا وێنایان بکات. ئینجا (خستنەناو)ی ئەو توخمانە بۆ ناو ئەو شێوە تایبەتە لەڕاستیدا گۆڕینیانە بۆ واقیعێکی نوێ. بە جۆرێ کە بوونیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە خودی خۆیدا بوونی نامێنێ وە یان لەشێوەی پاشکۆییو لایەنداری پێشویاندا نامێننەوە. بەڵکو دەچنە شێوەی پێکهاتەیەکی ئاوێتە لەنێو ئەو ژیارە نوێیەدا کە چوونەتە سەری، هیچ نەنگیو عەیبەیەکیش لە سەر هەر ژیارێك تۆمار ناکرێ کە ئەو توخمانە خراونەتە پاڵی بەڵکو عەیبەو ئابڕوچوون بۆ هەر ژیارێك ئەوەیە کە تەنها توخمە دەرەکیەکانی لەخۆ گرتبێت، هاوکات ئەو کارەشی بەشێوەیەکی پچڕو لەیەك دوورو پرژوبڵاو کردبێت، هەڵنەستابێت بە سەرلەنوێ پێکهێنانەوە یان لەخۆگرتن یان توانەوەیان لەخۆیدا، لەم حاڵەتە نوێیەشدا ئەوا ئەو توخمانە هیچ ئامادەبوونێکی لەبەرچاویان لەو

ژیارەدا نابێت، وە بەشێوەی ئەندامی بوون سەر بەو نابن. بەڵام ئەگەر ئەو ژیارە سەرکەوتوو بوو لە گۆڕین و وەرچەرخانی ئەو توخمانەو بتوانێ بیانخاتە نێو سیستمی خۆیەوە، ئەوا کرداری نواندن لەخۆداو وێناکردن دەبێتە بەڵگە لەسەر زیندوویەتیو جووڵەو داهێنانی ئەو ژیارە. کەواتە لەهەر ژیارێکی تەواودا، بە تایبەتی لە ژیاری ئیسلامدا ئەوا هەموو توخمە پێکهێنەرەکان ئیتر ماددی یان بونیاتگەریی یان پەیوەندگەریی بن دەچنە ژێر یەك پرەنسیپی باڵاوە، لە ژیاری ئیسلامیشدا ئەوا ئەو پرەنسیپە باڵایە یەکتاپەرستییە. کە ئەمەش بۆ موسڵمان پێوەری سەرەکیەو هاوکات بەڵگەو پێوەریەتی لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئایین و ژیارەکانی تردا. جا لە مامەڵەو هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ ڕاستیەکان و بارودۆخە نوێیەکاندا ئەوا هەر شتێك گونجاوو تەبابێت لەگەڵ ئەو پرەنسیپەدا ئەوا پەسەندەو وەردەگیرێو دەنوێنرێ، هەرشتێکیش گونجاو نەبێت ڕەتدەکرێتەوەو ڕیسوا دەکرێ.

یەکتاپەرستیش یان پرەنسیپی بەتاك ناساندنی خوای گەورە بەرەهاییو شکۆمەندیی و بەرزو بڵندییو مەبەستداریی ئەو زاتە ئەوە دەگەیەنێ کە تەنها خوای گەورە شایانی پەرستش بۆ کردن و گوێڕایەڵی کردنە، مرۆڤی گوێڕایەڵیش لەسایەی ئەو پرەنسیپەدا ژیانی خۆی بە زیندوو ڕادەگرێ. هەوڵیش دەدات هەموو کردارەکانی لەگەڵ ئەو پرەنسیپەدا ڕێکبخات و بۆ جێبەجێکردنی مەبەستی خوایی یەکبگرنەوە لەگەڵیدا. هەروەها دەبێ ژیانیشی بەڵگەبێت لەسەر یەکگرتن لەنێوان ئەقڵ و ئیرادەی دا، ئەمەش ئەو تاقە ئامانجەیە کە لە

کردارەکانیدا داوای دەکات، ژیانیشی نابێتە زنجیرەیەك رووداوی کۆکراوەی **هە**رچۆن بۆ گونجاوو بەرێکەوت ، بەڵکو پەیوەستن بە یەك پرەنسیپی گشتگیرەوەو لەیەك چوارچێوەدا کۆیاندەکاتەوە، لەنێو یەك یەکەدا، بەمجۆرەش ژیانی دەبێتە یەکجۆر شێوازو شێوەیەکی کامڵ ـ کە ئەویش ئیسلامە.

**٢ ـ ئەقڵگەرایی:**

ئەقڵگەرایی یەکێکە لە پێکهاتەکانی کرۆکی ژیاری ئیسلامی، بەو سیفەتە کە پرەنسیپکی میتۆدییە، ئەمیش لەسەر سێ بنەما یان یاسا دادەمەزرێ: **یەکەم:** رەتکردنەوەی هەر **هە**موو ئەو شتانەی کە لەگەڵ واقیعدا ناچەسپێن و یەکناگرنەوە لەگەڵیدا، **دووەم:** نکولیکردن لە **هە**موو دژ بەیەکە رە**ها**کان، **سێیەم:** کرانەوە لەسەر بەڵگە نوێیەکان یان دژو پێچەوانەکان. یاسای یەکەم موسڵمان دەپارێزێ لە گومان، واتە لە دروستبوونی **هە**ر جۆرە ئیدیعایەك بە شارەزابوون کە پشت ئەستور نەبێ بە بەڵگە یان بە سەلماندن، قورئانی پیرۆز بە راشکاوی وەسفی ئەو شارەزابوونە دڵنیانەکەرو نەسەلمێنراوە دەکات کە نموونەیەکە لەسەر (گومانبردن) یان ئەو شارەزابوونە گومڕاکەرەی کە ئامانجەکەی **هە**رچەندە کەم بێت **هە**ر خوای گەورە رێگیری لێکردووە[١]. ئالێرەوەیە

---

[1]- خوای گەورە رێگیریی لە مرۆۆ کردووە گومان بە هاوڵەکانی ببات: سورەتی النساء : ئایەتی (١٥٦)، سورەتی الانعام: ئایەتی (١١٥ و ١٤٨)، سورەتی یونس: ئایەتی (٦ و ٢٦)، سورەتی الحجرات: ئایەتی (١٢)، سورەتی النجم: ئایەتی (٢٣ و ٢٨).

موسڵمان بەوە وەسفدەکریٚ کە کەسێکەو تەنها ئیدیعا بەڕاستییەوە دەکات، یاسای دووەمیش لەلایەکەوە موسڵمان دەپاریٚزیٚ لە ساناترین دژەیەکی ، لەلایەکی تریشەوە دەیپاریٚزیٚ لە دژیەکی رواڵەتی[1]، ئەقڵگەرایی مانای ئەوە نیە کە ئەقلٚ پیٚشبخریٚ بەسەر وەحیدا، بەڵکو رەتکردنەوەی هەرجۆرە دژ بەیەکییەك کە لەنێوانیاندا بێتەگۆڕیٚ دەبێتە بناغەیەك بۆ نێوانیان[2]، ئەقڵگەرایی دەڕوانێتە گریمانە دژ بەیەکەکان، چەندینجارو بە دووبارەکردنەوە دەڕوانێتەوە پیایاندا لەبۆ گەڕان بەدوای روویەکدا کە دەکریٚ تێڕوانینەکە بازی بەسەردا دابێت، کە ئەگەر ئەو لایەن و ڕووە دۆزراوەیە بە هەند وەردەگیرا، ئەوا پەیوەندییە دژ بەیەکەکان دەخاتەڕوو، هەروەها ئەقڵگەرایی ڕاڤەکاری وەحی ـ نەك خودی وەحی ـ دەبات بۆ ڕاڤەکردنێکی تر، لەترسی ئەوە نەبادا مانایەکی نادیار یان ناڕوونی لە کیس چووبێت، کە ئەگەر جارێکیتر

---

[1] - ئەم زاراوە ئەغریقیە لە زمانی عەرەبیدا هاوتایەکی نیە، کە وێنای جیاوازی لە نێوان دوو ئەقلّیەت لە پشتی دوو زمانەوە دەکات، زاراوە ئەغریقیەکە ئاماژە دەکات بۆ باوەڕێکی نائەقلاّنی کە مەسیحیەکان خۆیان پابەند کردووە پێیەوە.

[2] - فەیلەسوفەکان لە کاتی حوکمدان بەسەر بانگەشە ئاینیەکاندا ژیریان بەرزکردوەتەوە بەسەر وەحیداو پێگەی پێشترو باشتریان بە ئەقلّ بەخشیوە. گومانیشی تێدانیە ئەوانە لەو کارەیاندا هەڵەبوون. بەدڵنیاییەوە دەڵێین کە بیرمەندی موسڵمان توانای هەیە لەسەر پێناسەکردنی ژیریی بەشێوەیەکی جیاوازو بەکارهێنانی ئەم پێناسەیە وەك بناغەیەك بۆ هەموو بانگەشەکانیتر، دەکریٚ بەحەتمیش پرسیار بکریٚ لە راست و دروستی هەردوو پێناسەکە، گومانیشی تێدانیە کە لەبارەی چەسپاندنی فەلسەفیو ئەقلّگیری ئەوا پێناسە ئیسلامیەکە— باشترو لەپێشترە —، ئەو پێناسەیەش کە لێرەدا هاتووەو دەڵیٚ ئەقلّگەرایی بریتیە لە رەتکردنەوەی دژە خودی، ئەوا بەهایەکی زیاتر دەبەخشیٚ بە درێژەدان بە میراتی پێشینانی چاکەکار.

سەیری کردەوە ئەوا هەرجۆرە لێڵی و ناڕوونییەکی پێشتری لەلا نامێنێ، ئەم پەنابردنە بۆ ژیری یان پەیبردن بە هەماهەنگی، نەك لە بەرگی خودی وەحی دا ـ چونکە وەحی لە سەرووی هەرجۆرە یاری پێکردنێکەوەیە لەلایەن مرۆڤەوە ـ بەڵکو لە ئاستی راڤەکردن یان تێگەیشتنی مرۆیی بۆی لەلای موسڵمان بەجۆرێکە کە تێگەیشتنی وەحی لەلای موسڵمان رێك بێت لەگەڵ ئەو بەڵگانەی کۆکراونەتەوەو ژیری خستونیەتەڕوو، لەڕاستیدا پەسەندکردنی دژیەکی یان ئاماژدانی گوماناوی بەشتێ گوایا راستییەکەو راستییەکی رەهایە مەسەلەیەکە تەنها لای کەسە ئەقڵ لاوازەکان پەسەندە. بەڵام موسڵمانی زیرەك ئەقڵ دەکاتە رێنماکاری خۆی، چونکە پێدادەگرێ لەسەر یەکبوونی هەردوو سەرچاوەی ڕاستییەکە: وەحی و ئەقڵ.

بەڵام یاسای سێیەم، واتە کرانەوە لەسەر بەڵگە نوێیەکان یان دژ بەیەکەکان، ئەمەش ئەو پرۆسەیەیە کە موسڵمان دەپارێزێ لە پیتگەرایی‌و دەقگەرایەو دەمارگیری‌و خواست و ڕەوتی پارێزگاریی کە سەردەکێشێ بۆ چەقبەستن، هەروەها دەیگێڕێ بەلای خاکیبوون لە هزردا، تاوای لێدەکات دەستەواژەی خوا زاناترە (والله أعلم) بلکێنێ بە هەر وتەیەکەوە کە بیسەلمێنێ یان نکوڵی لێبکات. موسڵمانیش لەسەر ئەو قەناعەتەیە کە راستی زۆر لەوە گەورەترە بتوانرێ بە تەواوەتی کۆنترۆڵ بکرێ‌و ئەم پەڕو ئەوپەڕی بزانرێت.

جا هەروەك یەکتاپەرستیی بریتیە لە بە ڕەهایی جەختکردن لەسەر تاکوتەنهایی خودایی، هەروەها جەختکردنە لەسەر تاکوتەنهایی ڕاستێتی،

كەواتە خودا (الله) لە ئیسلامدا ئەو راستیەیە، وە تاكوتەنهایی واتە تاكوتەنهایی سەرچاوەكانی ڕاستێتی، چونكە خوای گەورە بەدیهێنەری ئەو سروشتەیە كە مرۆڤ شارەزابوونی خۆی لێیەوە وەردەگرێ، ئامانجی شارەزابوونیش بریتیە لەو ئاڕاستە ڕێكوپێكەی ئەو سروشتە كە دروستكارەكەی هەر خوایە، گومانیشی تێدانیە كە خوای گەورە ئەو ئاڕاستە ڕێك و پێكانە دەزانیت، چونكە هەرخۆی دروستكەریانە، هەروەها گومانیشی تێدانیە كە هەرخوا خۆی سەرچاوەی وەحییە، خوای گەورە لە زانستی بێسنوری خۆی زانست بەشی مرۆڤ دەدات. زانستی ئەو زاتەش ڕەهاو گشتگیرە، خوای گەورەو باڵادەست زاتێكە نەخەڵەتێنەرەو نە ناوەندێكی قین لەدڵە مەبەستی بێت كە خەڵكی گومڕا بكات و لە ڕێگای راست لایانبدات، هەروەها حوكمی خۆی ناگۆڕێ وەها كە خەڵكی دەیكەن كاتێ كە دێن پەنا دەبەنەبەر هەمواركردنی زانستەكەیان یان دێن نیەتەكان یان بڕیارەكانیان چاك دەكەن، خوای گەورە كامڵەو زانایە بە هەمووشت، خوای گەورە هەڵە ناكات، بەوپەڕی شانازییەوە دەڵێین خوای ئایینی ئیسلامی شكۆدارو باڵایە.

### ٣ ـ لێبوردەیی:

لیبوردەیی بەو سیفەتە كە پڕەنسیپێكی میتۆدییە، ئەوە دەگەیەنێ كە رازی بیت بەوەی هەنووكە لە بەردەستدایە تا ئەوكاتە پووچەڵی و ناڕەواییەكەی دەسەلمێنرێ، بەپێی ئەم مانایە ئەوا پەیوەندە بەتیۆری شارەزابوون (**معرفة**)وە، هەروەها پەیوەندە بە فەلسەفەی رەوشتەوەو

بەو سیفەتە کە پڕەنسیپی قبوڵکردنی خواستێکە تا ئەوکاتەی خواستەکە پووچەڵ بوونەوەی دەسەلمێ[1].

لێرەوە زاراوەی فراوانی (**السعة**) دەدرێ بەسەر حاڵەتی یەکەمدا، وە زاراوەی ئاسانکاری (**اليُسر**) دەدرێ بەسەر حاڵەتی دووەمدا. هەردوو زاراوەکەش بۆ پاراستنی موسڵمانە لە داخران بەڕووی جیهاندا، هەروەها پاراستنیەتی لەڕەوتی پارێزگاریی کوشندە، هەردووکیشیان بۆ هاندانی موسڵمانە لەسەر پێشوازیکردن لە ژیان و لە ئەزموونی نوێ.

هەروەها لە هەردووکیاندا هاندان بۆ موسڵمان لەسەر وەرگرتنی راستییە نوێیەکان دەبینرێ بە ئەقلێ پشکنەری خۆی و بە هەوڵی بونیاتنەری خۆی، بەمشێوەیەش ئەزموونی و ژیانی خۆی دەوڵەمەند دەکات، وە بەهەمان پێودانگ و بە بەردەوامی پاڵدەنێ بە کەلتورو ژیارەکەیەوە بۆ بەرەوپێش چوون.

لێبوردەییش بەو سیفەتە کە پڕەنسیپێکی میتۆدیەو لە دووتوێی کرۆکی ژیاری ئیسلامیدایە، دڵنیایی و یەقینمان دەداتێ کە خوای گەورە خەڵکی فەرامۆش نەکردووە بەڵکو لەنێو خۆیانەوە پێغەمبەرێکی بۆ رەوانە کردوون تا فێریان بکات کە جگە لەخوا هیچ خوایەکیتر بوونی

---

[1]- بەڵگە لەسەر ئەم مانایە لەو ئایەتە پیرۆزانەدایە کە مشتومڕ لەسەر حەرامکردنی ئارەزوومەندانە دەکەن، وەك: سورەتی المائدة: ئایەتی (٩٠)، سورەتی الاعراف: ئایەتی (١٣ )، سورەتی التحریم: ئایەتی (١)، هەروەها لەو پڕەنسیپە شەرعیە ئوسولیەدا هاتووە کە زانایان کۆدەنگن لەسەری و دەڵێ: (هیچ شتێ حەرام نیە تا بەدەقێك حەرام نەکرێ). هەروەها بڕوانرێتە ئایەتی ﴿ وَقَدۡ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيۡكُمۡ ﴾ **الأنعام:** ١١٩ و ١٥٣).

نیه ، ئەوانیش لەسەریانە کە پەرستشی بۆ بکەن و گوێڕایەڵی بن[١]، لە هەمان کاتیشدا وریایان دەکاتەوە لە خراپەو لە هۆکارەکانی[٢]. بەمجۆرە لێبوردەیی ئەو قەناعەتەمان لا دروست دەکات کە هەموو خەڵکی پەیپێبردنێکی سروشتییان هەیەو هاوکاریان دەبێت لەسەر شارەزابوون لە ئایینی راست و دروست، هەروەها ویستی خوای گەورەو فەرمانەکانی روونەدەکاتەوە بۆیان، لێبوردەیی ئەو قەناعەتەمان دەداتێ کە هۆکاری جیاوازی لەنێوان ئایینەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو وە بۆ ئەو هەموو هۆکارانە کە کاریگەرن لەسەری، هەروەها بۆ بارودۆخی جۆراوجۆرو جیاواز لە کات و لە شوێندا، هاوکات بوونی ئەو هەموو جۆرە تاوانانەی دەکرێنە کۆڵی بەرانبەرو توڕەیی و سۆزداریو بەرژەوەندییانەی کە وان تیایدا، مەعلومە کە لەپشت هەموو فرەجۆری ئایینیەوە ئایینێکی پاکوبێگەرد هەیە، ئەویش ئەو ئایینەی خوای گەورەیەیە کە هەموو خەڵکی لە سەرەتاوەو بەرلەوە بێن و ببنە شوێنکەوتەی فڵانە ئایین یان فڵانیتر بەسروشتی لەسەری بوون. لێبوردەیی لە موسڵمان دەخوازێ

---

[1] - بڕوانە سورەتی **الأنعام** : ئایەتی (٤٢)، سورەتی یوسف: ئایەتی (١٠٩)، سورەتی الرعد: ئایەتی (٤٠)، سورەتی إبراهیم: ئایەتی (٤)، سورەتی الحج: ئایەتی (٩) ، سورەتی النحل: ئایەتی (٤٣)، سورەتی الاسراء: ئایەتی (٧٧)، سورەتی **الانبیاء**/ ٧ و ٢٥، سورەتی **المؤمنون**: ئایەتی (٤٤) ، سورەتی الفرقان: ئایەتی (٢٠)، سورەتی الروم: ئایەتی (٤٧)، سورەتی الصّافات: ئایەتی (٧٢)، سورەتی غافر: ئایەتی (٧٠) .

[2] - بڕوانە سورەتی النساء: ئایەتی (١٦٢)، سورەتی **فاطر**: ئایەتی (٢٣)، ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ **الأنبياء**: ٢٥.

که بێت بێلایەنانە لێکۆڵینەوە بکات لەسەر مێژووی ئایینەکان، تا یەکەمین بەخششی خوای گەورەی لەهەر ئاینێکدا بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەو بەخششەی که خوای گەورە پێغەمبەرانی له هەموو کات و شوێنێکدا ڕەوانەکردووە تا بیگەیەنن بە خەڵکی[١].

له بواری ئایینیشدا ـ که له تەواوی پەیوەندییە مرۆییەکاندا شتێك نیە گرنگی لەو زیاتری هەبێت ـ ئەوا پڕەنسیپی لێبوردەیی هەر ڕووبەڕووبونەوەو ناڕەزاییەکی ئەملا بەرانبەر ئەولا لەنێوان ئایینەکاندا دەگۆڕدرێ بۆ لێکۆڵینەوەی زانستیانەی پشت ئەستور بە بەڵگەی سەلمێنەر که باس له پەیدابوونی ئایینەکان و پەرەسەندن و گەشەکردنیان دەکات، بۆئەوەی ئەو باسە مێژووییە کەڵەکەبووانە لە بەخششە ڕەسەنەکانی وەحی جیابکاتەوە وە لەبواری ڕەوشتیشدا که له بایەخ پێداندا بە پلەی دووەم دێت، ئەوا (ئاسانکاری) دەبێتە قەڵای پارێزەر بۆ موسڵمان دژ بەهەر مەیل و حەزێك که نکولی له ژیان بکات، بەلانیکەمەوە کەمترین ئاستی گەشبینی پێویست بۆی فەراهەم دێنێ تا پارێزگاری بکات له دروستیی و هاوسەنگیەو پێدانی قەبارەی شیاو بەو کارە. جا وێڕای بوونی ئەو هەموو کارەسات و بەڵایانەی که تووشی ژیانی مرۆڤایەتی دەبن، ئەوا خوای گەورە هەر بەندەی خۆی دڵنیاو دڵئاسودە دەکات که لەدوای هەر تەنگانەو ناڕەحەتیەك گوشادی و خۆشی دێت(إن مع العسر يسرا)[٢]، جا هەروەك خوای گەورە فەرمان بە بەندەکانی دەکات  که لەپێش دەرکردنی بڕیاری حوکم لێکۆڵینەوە لەڕاستی

---

[1]- سورەتی الروم: ئایەتی (٣٠).

[2]- سورەتی الشرح: ئایەتی (٦).

یان ناڕاستی هەر داواو سکاڵایەك بکەن[1]، ئەوا زانا ئوسوڵیەکانی شەرعیش بەر لەحوکمدان بە چاك یان بە خراپ لەسەر هەر فەرمانێکی ویستراو پەنادەبەنە بەر ئەزموونی تاقیکردنەوە بەجۆرێ کە راشکاوانە دژ نەبێت لەگەڵ فەرمانی خواییدا.

هەردوو پرەنسیپی فراوانی و ئاسانکاری راستەوخۆ لە یەکتاپەرستییەوە دەردەچن، بەو سیفەتە کە پرەنسیپێکە لە فەلسەفەی رەوشتدا، کەواتە ئەو خوای گەورەیە کە مرۆڤی دروستکردووە ئازادی و توانایی بۆ بەجێهێشتووە لەسەر ئەرێنی بوون لە کاری جیددی و گەرم و گوڕو جووڵەی هۆشیارانە لەم دنیایەدا، تا لەبواری کارکردندا لێهاتوویی و شایستەیی خۆی بسەلمێنێ، ئایینی ئیسلامیش وادەبینێ کە هەر ئەمە هۆکاری بوونی مرۆڤە.

## دووەم: لایەنی ناوەڕۆك

**یەکتاپەرستیی بەو سیفەتە کە یەکەم پرەنسیپە لە فەلسەفەی میتافیزیکی دا** مەعلومە کە شایەتومانی: جگە لە (اللّه) هیچ خوایەکی تر بوونی نیە (لا إله إلاّ الله) بە واتای باوەڕهێنانە کە خوای گەورە ئەو تاکە بەدیهێنەرەیە کە بوونی بەخشیوە بە شتەکان، وە هەرخۆی هۆکاری باڵایە لە هەموو ئەوەی کە روویداوە، وە تەنها خۆی کۆتا وێستگەو قیبلەگای چارەنووسی هەبووەکانە، هەرخۆی یەکەم و کۆتایە، گوتنی ئەم شایەتومانە بە ویست و بە رەزامەندی و بە

---

[1]- سورەتی الحجرات: ئایەتی (٧).

قەناعەتەوە، وە بە تێگەیشتنێکی هۆشیارانەوە بۆ ناوەڕۆکەکەی، دەبێتە هۆی پەیبردن بەوە کە هەرهەموو ئەو شت و ڕووداوانەی دەورەیان داوین، وە هەموو ئەو شتانەی کە لە گۆڕەپانە سروشتی و کۆمەڵایەتی و دەروونیەکاندا دەگوزەرێن دەستکردو کاری خوای گەورەن، وە بۆ راپەڕاندنی مەبەستێك لە مەبەستەکانی ئەو زاتە گەورەیەن، جا کاتێ کە مرۆڤ پەی بەمە دەبات ئیتر دەبێتە خوویەکی خۆڕسك و سروشتێکی دووەم بۆ مرۆڤ و بەدرێژایی کاتژمێرەکان حاڵەتی بەئاگابوون لێی جیانابێتەوە، بەم پێیە مرۆڤ لە هەموو ساتەکانی ژیانیدا لە سێبەری ئەو پەی پێبردنەدا دەژی، کاتێکیش کە مرۆڤ کارو فەرمانی خوای لە هەموو شتێك و رووداوێکدا بۆ ڕووندەبێتەوە ئیتر دەبێتە شوێنکەوتەی ئەو دەستپێشخەرییە خواییە چونکە لەلایەن خوای گەورەوەیە.

سەرنجدان لەم دەستپێشخەرییە لە سروشتدا واتە خەریکبوون بە زانستی سروشتییەوە[1]، چونکە دەستپێشخەری خوایی لە سروشتدا جگە

---

[1] - زانستە سروشتیەکان پەرەیان نەسەند تا ئەوکاتەی ئەو رایە وەرنەگیرا کە دەڵێ ڕووداوە سروشتیەکان بە بەردەوامی پاشکۆو شوێنکەوتەی یاسا نەگۆڕەکانی خۆیانن، ئەمەش دەقاودەق ئەو مەعلومەیەیە کە ئیسلام بۆ پەرەپێدانی زانستی سروشتی لەنێو شوێنکەوتوانیدا پێشکەشی کردووە.

پێداگری ئیسلام لەسەر ڕێکخستنی بونەوەر بە فەرمانی خوای گەورە یارمەتی دا لەسەر فەراهەمهێنانی کە شوهەوای پێویست بۆ گەشەکردنی رۆحی زانستی، بەڵام ئەو باوەڕە پێچەوانەیەی کە دەڵێ سروشت جێگیربوونی نیەو و لەسەر یەك بار ناوەستێ، بەڵکو ئەوە

لەوە کە کۆمەڵە یاسایەکی نەگۆڕن و خوای گەورە بەخشیویەتی پێی شتێکیتر نیە[1]، جا لەڕاستیدا ئەگەر کاری سەراپای بونەوەر کردنەوەی ئەو یاسایانە بێت لە سروشتدا یان پراکتیزە کردنیان بێت چونکە ئەوانە فەرمانی خوای گەورەو ئیرادەی ئەو زاتەن، ئەوا ئیتر بونەوەر لەپێش چاوی موسڵماندا وا دەردەکەوێ کە شانۆیەکی زیندوەو بە فەرمانی خوا دەجولێ، دەکرێ خودی شانۆکەو هەموو ئەوەش کە تێیدایە لەو سنورەدا راڤە بکرێ، لەبەرئەوە مانای تاکوتەنهایی خوای گەورە وەهایە کە هەرخۆی هۆکارە لە هەموو شتێکداو جگە لە خۆی هۆکارێکیتر بوونی نیە.

ئەمەش ئەو گوتەیە بەدوای خۆیدا دێنێ کە هەردەبێ بوترێ و دەڵێ یەکتاپەرستیی واتە سڕینەوەو نەهێشتنی هەرجۆرە هێزێکی بکەرو کارا لە سروشتدا بە تەنیشت خوای گەورەوە، دەستپێشخەرییە هەمیشەییەکەش بریتیە لەو یاسا نەگۆڕو جێگیرانە لە سروشتدا. ئەمەش نکولی و ملەجیڕەی هەرجۆرە دەستپێشخەریەك لە سروشتدا لەلایەن هەر هێزێکەوە بێت رەتدەکاتەوە وەك سیحرو فاڵچیەتی و

بواری کارو کرداری کۆمەڵە خوا زۆردارو زەبرو زەنگەکانە کە بەرجەستە بووە تیایدا، یا هێزی سیحرئامێز زاڵبووە بەسەریدا. ئەم باوەڕە بە هیچ جۆر نابێتە هۆی پەیدابوونی زانست.

[1]- بە پێچەوانەی مێژوو کە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوێکی دیاریکراو دەکات و شیکارەکردنیشی دەگێڕێتەوە بۆ پێکهاتە تاکەکان و ئەوکات پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکراوەکان دادەمەزرێنێ لەسەری، ئەوا زانستە سروشتیەکان بایەخ دەدەن بە شێوەی چەشنی و گشتی و بە یاسای گشتگیر کە هەموو وردەکاریەکان لە جۆرێکی تایبەتدا دەچەسپێ بەسەریدا ، وە یان هەموو تاکەکانی ئەو جۆرە یان هەموو جۆرەکانی.

ڕۆحەکان یان هەر خایلەیەکی شاراوەو نادیار لە بەزۆرەملێ دەستوەردان لە پرۆسە سروشتیەکاندا ئیتر لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێت کەساس و لاوازیشیان دەکات جگە لەو هێزەی کە لەنێو سروشتدا بوونی هەیە،. بەم پێیەش یەکتاپەرستیی واتە داماڵینی پیرۆزی لە بوارە سروشتیەکانداو ڕەنگپۆشکردنی بە سیفەتێکی نائایینی، ئەم ڕاستیە بەرەهایی مەرجی یەکەمە لە زانستی سروشتدا، کەوابوو لە ڕێگای یەکتاپەرستییەوە سروشت لە ئایینە سەرەتاییەکاندا جیابوویەوە لەخواکان و ڕۆحەکان، وە ئەوە یەکتاپەرستیی بوو توانی بۆ یەکەمجار بیرۆکەی ئەو زەینە ئایینیەی کە دروستکاری ئەفسانەکان بوو لەسنوری خۆیاندا بەرتەسکیان بکاتەوە، لە هەمانکاتدا زانستە سروشتیو ژیارییەکان بە دەستخۆشی تێڕوانینی ئایینی کە ڕاڤەی جیهان دەکات توانیان پەرەبسێنن و بەشێوەیەکی یەکجارەکی هەرجۆرە پەیوەستبوونێ لەنێوان پیرۆز و سروشتدا ڕەتبکاتەوە، یەکتاپەرستیش دژە لەگەڵ شتی خورافی یان ئەفسانەیی، چونکە ئەم دووانە دوژمنن بە ژیارو بە زانستی سروشتی، ئەو زانستەش تەواوی تاڵە دەزووەکانی یاسای هۆکارەکان (**السببية**) لەخۆیدا کۆدەکاتەوەو دەیانگێڕێتەوە بۆلای خوا نەك بۆلای هێزە شاراوەکان، لەم کاتەشدا ئەوا هێزی هۆکارییە (**السببية**)ی بکەرو کارا لە هەر ڕووداوێك یان شتێك ڕێکدەخرێ تا ببێتە ڕایەڵەیەکی بەردەوام و بەکردەی هۆکاریی (**السببية**) و پاشتریش بە کردارێکی ئەزموونی بەشەکانی پەیوەست بکرێن بەیەکەوە، ، چونکە دواجار ئەم تاڵی ڕایەڵە دەگێڕدرێتەوە بۆ

خوای گەورە، کەواتە کارەکە ئەوە دەخوازێ کە لە بواری پراکتیزەکردنی هێزە هۆکارییەکە یان کاراکردنەکەیدا هیچ هێزێك لە دەرەوە دەست وەرنەداتە کاری، ئەمەش لە پێشەکیدا بەدەوری خۆی ئەوە دەخوازێ پێکەوەبەستن لەنێوان بەشەکاندا هۆکارییەتی بێت، وە دەبێ لەپێش دان پێداانانی بخرێتە ژێر پشکنینی ئەزموونیەوە، جا بەو پێیە کە یاساکانی سروشت ئەو ئاڕاستە رێکوپێکە خواییەن کە هاوتای نیەو لە وێنەی نیە، واتە لەرێگای هۆکارەکانەوە خوای گەورە رایەڵەکانی سروشت رادەگرێ، شێوەی رێکخستنیش وەرناگرێ هەتا هۆکارەکە لە هۆیەکی ترەوە نەبێت کە بە هەمیشەیی هەڵگری هەمان سیفەتی هۆکارەکە بێت، بەردەوامبوونی هۆکاریش دەقاودەق وای لێدەکات کە پشکنین و دۆزینەوەی - پاشتریش زانینی - کارێکە لەتوانادایە، زانستیش جگە لەوە کە گەڕانە بەدوای ئەمجۆرە هۆکارییە چەندبارە بوویەوەی کە لە سروشتدا روودەدات شتێکیترنیە، چونکە پەیوەندییە هۆکاریەکان کە رایەڵەی هۆکاریەتی پێکدەهێنن لە رایەڵەکانی تریشدا دووبارە دەبنەوە، دامەزراندنیشیان دامەزراندنی یاساکانی سروشتە، ئەمەش خواستێکی پێشینەیە بۆئەوەی هێزە هۆکارییە سروشتیەکان بچنە ژێر رکێفی کۆنترۆڵکردن و ئاڕاستەکردن، وە مەرجێکی پێویستە بۆ لەزەت وەرگرتنی مرۆڤ لە سروشت.

## یەکتاپەرستیی بەو سیفەتە
## کە یەکەم پرەنسیپە لە فەلسەفەی رەوشتدا

یەکتاپەرستیی جەخت لەوە دەکات کە خوای گەورە مرۆڤی لەسەر جوانترین شێوە دروستکردووە، تا خوای گەورەی بپەرستێو بە پیرۆز رایبگرێ[١]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کۆی مەبەستی بوونی مرۆڤ لە سەرزەویدا ئەوەیە گوێڕایەڵی خوا بێت و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات، ئەم یەکتاپەرستییە هەروەها جەخت دەکات کە مەبەستەکە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە مرۆڤ جێنشینی خوای گەورەیە لەسەر زەویدا[٢]، قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکات کە خوای گەورە ئەم ئەمانەتەی خستوەتە سەرشانی مرۆڤ، ئەو ئەمانەتەی کە ئاسمانەکان و زەوی نەیانتوانی هەڵیبگرن و لە دیمەنێکی تۆقێنەردا سڵەمینەوە لە هەڵگرتنی[٣]. ئەم متمانەی پێ سپاردنی ئەمانەتە خواییە بریتیە لە ڕاپەراندنی بەشی رەوشتی لە ویست و ئیرادە خواییەکە، ئەم ئیرادەیەش بە سروشتی خۆی ئەوە دەخوازێ ئازادانەو بێ زۆرەملێ جێبەجێ ببێت، مرۆڤیش ئەو تاکە دروستکراوەیە کە توانای هەڵگرتنی ئەو کارەی هەیە، جائەگەر ئیرادە خواییەکە لە دووتوێی حوکمی یاسای سروشتیدا جێبەجێ ببێت ئەوا جێبەجێ بوونەکە لەو حاڵەتەدا رەوشتی نیە، بەڵکو جەوهەرییە

---

[1]- بەپێی دەقی ئایەتی ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴾ **الذاريات: ٥٦.**

[2]- بڕوانە سورەتی **البقرة**: ئایەتی (٤٠)، سورەتی الانعام: ئایەتی (١٦٥)، سورەتی یونس: ئایەتی (١٤).

[3]- سورەتی الاحزاب: ئایەتی (٧٢).

یان سودمەندییە، تەنها مرۆڤیش توانای هەیە لەسەر جێبەجێکردنی ویستی خوایی، لەگەڵ بوونی ئەگەری هەستانی بەکردن و ئەنجامدانی یان نەکردنی. وە یان تەواو بە پێچەوانەوەکەی بکات، یان هەر شتێکیتر لەنێوان هەردوو حاڵەتەکەدا، لەڕاستیدا پەیڕەوکردن و کارکردن بەم ئازادییە مرۆییە لەبۆ گوێڕایەڵیکردنی فەرمانی خوای گەورە هەر ئەوەیە کە راپەڕاندنی فەرمانەکە دەکاتە کارێکی رەوشتی.

یەکتاپەرستیی جەختدەکات کە خوای گەورە بە سۆزو بەزەیی خۆیو بەنیەت و بە مەبەستی خۆی مرۆڤی بۆ گاڵتەو گەپ یان بە بێهودە دروست نەکردووە، بەڵکو هەستەوەرەکان و ژیریو تێگەیشتنی پێبەخشیوەو کردوویەتە کەسێکی کامڵ و تەواو، هەر لە رۆحی خۆی فووی کردووە بە مرۆڤدا[1] تا شیاوو ئامادەی بکات بۆ هەستان بە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە مەزنە.

هەر ئەم ئەرکە مەزنەیە کە هۆکاری بەدیهێنانی مرۆڤە، وە کۆتا ئامانجی بوونی مرۆڤیشە، ئەم ئەرکە مەزنەیە کە ئەرکی سروشتیو چییەتی (**ماهية**) مرۆڤ دیاریدەکات و مانای ژیان و بوونی لە سەرزەوی روونده‌کاتەوە، جا بە فەزڵی ئەمە مرۆڤ ئەرکێکی گەردوونی پێ دەسپێردرێ کە بایەخێکی هەر زۆر گەورەی هەیە. وە ئەگەر ئەم بەشە باڵایەش لە ئیرادەی خوایی نەبووایە کە مەبەستی رەنج و هەوڵی رەوشتیی مرۆڤە ئەوا ئەم بونەوەرە بەمجۆرە نەدەبوو کە ئێستە وا

[1]- بڕوانە سورەتی الحجر: ئایەتی (٢٩) ، سورەتی **الانبياء**: ئایەتی (٩١)، سورەتی ص: ئایەتی (٧٩)، سورەتی التحريم: ئایەتی (١٢).

لەسەری. لەم بونەوەرەشدا دروستکراوێکیتر نیە کە بتوانێ جێگای مرۆڤ بگرێتەوەو هەستێ بە راپەڕاندنی ئەم ئەرکە گەورەیە، مرۆڤ تاکە پردە لە بونەوەردا کە دەکرێ بەشی رەوشتی ـ کە بالاترین ئامانجە ـ لە ئیرادەی خوایی بە ئاڕاستەی شوێن ـ کات پیایدا تێپەڕی، تا سەرئەنجام ببێتە مێژوویەك.

ئەو (ئەرك پێسپاردن)ە یان بەرپرسێتیەی کە خراوەتەوە سەر مرۆڤ و نەدراوە بەسەر هیچ دروستکراوێکی تردا بەهیچ جۆر لە سنورێکدا ناوەستێت، بەڵکو ئەو بەرپرسێتیەی تەواوی بونەوەر دەگرێتەوە. سەراپای رەگەزی مرۆییش لە کرداری رەوشتی مرۆیی‌دا ئەو ئامانجە دەیگرێتەوە، مەودای گۆڕەپانەکەش هەموو زەوی و ئاسمانە، مرۆڤ بەرپرسە لە هەر هەموو ئەوەی لە بونەوەرداو لە هەر پارچەیەکیدا کە لە دوورترین شوێنیەوە روودەدات، چونکە ئەرك پێسپاردنی مرۆڤ گشتگیرو گەردوونیە، تا رۆژی قیامەتیش کۆتایی نایەت.

ئایینی ئیسلام جەختدەکات کە ئەرك پێسپاردن بناغەی مرۆیی بوونی مرۆڤ و ماناو ناوەڕۆکیەتی، وە ڕازیبوونی مرۆڤ بە هەڵگرتنی ئەو کۆڵە قورسە، ئەوەیە کە بەرزی دەکاتەوە بۆ سەروو ئاستی دروستکراوەکانیتر، بەڵکو بۆ سەرووی ئاستی فریشتەکانیش، کەواتە جگە لە مرۆڤ هیچ دروستکراوێکی تر توانای هەڵگرتنی ئەو بەرپرسێتیەی نیە، ئەمەش وێنای ناوەڕۆکی گەردوونی مرۆڤ دەکات، دەبێ ئەوەش روون بێت کە جیاوازییەکی بەرفراوان هەیە لەنێوان مرۆڤایەتی لە ئیسلامداو نێوان باقی مرۆیی بوونەکانی تر کە لە غەیری ئیسلامدا هەیە، بۆ نموونە ژیاری

ئەغریقی ئاراستەیەکی بەهێزی پەرەپێدا بەرەو مرۆیی بوون، ئینجا خۆرئاوا لە سەردەمی رێنیساندا کردییە نموونەو پێشەنگ بۆ خۆی. رێچکەی ئەغریقیەکان بۆ تیۆری مرۆڤایەتی دامەزرا بوو لەسەر رۆچوون لە رێچکەی سروشتیدا تا ئاستی بەخواکردنی مرۆڤ و نکولیکارانی لەیەك کاتدا، لەبەرئەوە کاتێ کەسێکی ئەغریقی وێنەی خواکانی لە حاڵەتی فێڵ لێکردن یان پیلان گێڕانی هەندێك لە خواکان لەسەر هەندێکی تریان یان ئەنجامدانی بێئابڕویی یان خراپە یان دزیکردن یان دەستدرێژی یان ئێرەیی بردن یان تۆڵەکردنەوە لەنێوانیاندا یان هەر کردەوەیەکیتر لە کرداری دڕندە ئامێز دەگرت هەستی بە بێزاربوون نەدەکرد.

جائەگەر ئەو کردەوانە لە خودی رەگەزی ماددی ژیانی مرۆیی حیساب بکرێ ئەوا بەو تێڕوانینە سەیر دەکرێن کە شتانێکی سروشتین و وەك کردەوە چاکەکان و سیفەتەکانی کامڵبوون و هەردووکیشیان پێکەوە وان، هەروەك باری سروشت وەهایە کە دادەنرێن بە سیفەتی خوایی کە شایانی تێڕامانن لە شێوە جوانیەکەیاندا، ئەمەش شایانی ئەوەیە کە لەلایەن مرۆڤەوە بپەرسترێو لاسایی بکرێتەوە، چونکە خواکان واتە وێنەی خوایی مرۆڤ، وە لەلایەکی تریشەوە ئایینی مەسیحی لە قۆناغی دروستبوونیدا دژ بوو لەگەڵ ئەم مرۆیی بوونە ئەغریقیە ـ رۆمانیەو تا ئەوپەڕی وەستا لە دژی ئەم بۆچوونە، سەرەنجام لە دووتوێی (هەڵە سەرەکی ـ بنەڕەتی)یەکەوە رێزو ئاستی مرۆڤی هێنایە خوارەوە، وە رایگەیاند کە (دروستکراوێکی نزمە) یان (بارستەیەکی هەڵە کارە)[١]. لەڕاستیدا دابەزینی

---

[1]- بە پێی دەستەواژەی قەشە ئۆغستین.

مرۆڤ بۆ ئاستی جۆرێك لەو حاڵەتی هەڵەکارییە رەهاو گشتگیرو سروشتییە ئەنجامێکی حەتمییە، کە هیچ مرۆڤێك بە هەوڵی تایبەتی خۆی توانای نیە خۆی دەربهێنێتەوە لێیو خۆی رزگار بکات، بەم پێیە ئەوا مەرجێکی لۆژیکییە کە خوای گەورە لەو بڵندیەوە خۆی بەرجەستە بکات و ئازاری هەڵە بچێژێو لە بەرئەنجامی هەڵەی مرۆڤەوە بمرێت، وە بە دەستەواژەیەکی تر، ئەگەر رزگاربوون بەهۆی خوای گەورەوە رووبدات، ئەوا دەبێ گێژاو و گرفتێك ببێو بە ئاستێکی وەها مەترسیدار بێت کە جگە لەخوا ئیتر لە توانای کەسیتردا نیە مرۆڤ لەو زەلکاو و هەڵەیە دەربهێنێ، ئەگەر بەمجۆرەش بێ ئەوا هەڵەی مرۆڤ بە ئاستێکی وەها رەهایە کە (شایانی) ئەوە بێت خوای بۆ لە خاچ بدرێ. باوەڕی هیندۆسی رەگەزی مرۆیی دابەشکردووە بۆ چەند چینێك، چینە نزمەکانی تایبەتکردووە بۆ زۆربەی رەگەزی مرۆیی، ناوی ناون (بێزلێکراوەکان) ئەگەر لە خەڵکی هیند بن، وە ناوی (مالیتجا) یان بە دیدی ئایینی پیس بووان ئەگەر لە مرۆڤەکانیتر بن، تاکەکانی چینی خوارەوە یان غەیری ئەوانیش بۆیان نیە لەم ژیانەدا بەرزببنەوەو بچنە نێو چینی دووەم نێو(بەرهەمیەکان) کە چینێکی جیاکارو پاك و بەرزترن، چونکە ناکرێ ئەم گواستنەوەیە بکرێ مەگەر دوای مردن ئەویش لە رێگای کۆپیکردنی رۆحەکانەوە، (تناسخ الارواح) چونکە لەم ژیانەدا مرۆڤ بە زۆرەملێ سەر بەو چینەیە کە تیایدا لە دایکبووە، هەر هەوڵێکی رەوشتیش بۆ قورتاربوونی خاوەنەکەی بێسودە مادامێ لەم دنیایەدایەو زیندووە، دواجاریش، باوەڕی بوزی وەهایە کە حوکم بەسەر

ژیانی مرۆڤ و دروستكراوەكانی تریشدا دەدات كە هەر هەمووی سزاو ئازارو چەرمەسەرییەو كۆتاییشیان نایەت، بوزی باوەڕی وایە كە خودی بوون خۆیشی هەر خراپەیە، تاكە ئەركی مرۆڤیش كە دەكرێ مانایەكی هەبێت ئەوەیە كە بە هەموو توانای هەوڵبدات بۆ كۆنترۆڵكردنی دەروونی خۆی و بە كۆششی ئەقڵی خۆی تا رزگاری ببێت لەو هەبوونە.

كەواتە تەنها مرۆڤایەتی یەكتاپەرستییە كە رەسەن و پاكو بێگەردە، بە تەنها یەكتاپەرستییە رێز لە مرۆڤ دەگرێت بەو سیفەتە كە مرۆڤەو دروستكراوە، بێ بەخواكردنی یان بەكەم سەیركردنی، تەنها یەكتاپەرستییە بەهای مرۆڤ دیاریدەكات بەو چاكانەی كە دەیڕازێننەوەو جوانی دەكات، هەڵسەنگاندن و بە بەهاگرتنی مرۆڤ ئاماژەیەكی راشكاوەو بەو بەهرە سروشتییە دەست پێدەكات كە خوای گەورە رژاندویەتی بەسەر هەموو خەڵكیدا تا ئامادەیان بكات بۆ هەستانیان بە ئەركی جوامێریان، ئەوە تەنها یەكتاپەرستییە كە لە چوارچێوەی ناوەڕۆكەكانی خودی ژیانی سروشتیدا چاكەكان و ئاكار و رەوشت و نموونە باڵاكان دیاریدەكات نەك وەها كە نكولیان لێبكات لە ژیانی مرۆڤدا، بەمشێوەیەش مرۆڤایەتی یەكتاپەرستیی دەبێتە مەسەلەیەكی رەوشتی، ئەمیش بە تەنیشت سیفەتی جەختكردنەوەی لە ژیان.

## یەکتاپەرستیی بەو سیفەتە
## کە یەکەم پڕەنسیپە لە زانستی بەهاکان دا

یەکتاپەرستیی جەختدەکات کە خوای گەورە ڕەگەزی مرۆڤی دروستکردووە، تا خەڵکی لە ڕێگای کردەوەکانیانەوە ڕەوشتداریی خۆیان بسەلمێنن[١]، خوای گەورە کۆتا ناوبژیوانی بەرزو باڵایە، وریایی دەدات بە هەموو خەڵکی کە دواجار لەسەر کردوەکانیان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت[٢]، هەرکەسیش چاکەیەك بکات پاداشتی بەچاکە دەدرێتەوە، هەرکەس خراپەیەك بکات دووچاری سزادان دەبێت[٣]، یەکتاپەرستیی جەخت کردنەوەیەك زیاد دەکات و دەڵێ خوای گەورە مرۆڤی لەسەر زەویدا دروستکردووە تا هەستێ بە ئاوەدانکردنەوەی[٤]، واتە تا بگەڕێ و بەهەموو لایەکیداو گەشت بکات، لە بەرووبومەکەی بخوات و لەزەت لە خێرو بێرو لە جوانیەکەی وەربگرێ، بەمجۆرە زەوی ئاوەدان دەبێتەوەو گەشە دەکات و مرۆڤیش دەبێتە کەسی سەرکەوتوو و براوە تیایدا[٥]،

---

[1]- بڕوانە سورەتی هود: ئایەتی (٧)، سورەتی الكهف: ئایەتی (٧)، سورەتی محمد: ئایەتی (٣١)، سورەتی الملك: ئایەتی (٢).

[2]- سورەتی التوبە: ئایەتی (٩٥ و ١٠٦).

[3]- سورەتی **الزلزلة**: ئایەتی (٧ و ٨)، سورەتی **القارعة**: ئایەتی (٦ و ١١).

[4]- سورەتی هود: ئایەتی (٦١).

[5]- بڕوانە سورەتی **البقرة**: ئایەتی (٥٧، ١٧٢)، سورەتی **المائدة**: ئایەتی (٩٠)، سورەتی الاعراف: ئایەتی (٣١ و ١٥٩)، سورەتی **طه**: ئایەتی (١١ )، سورەتی الملك: ئایەتی (١٥)، سورەتی الليل: ئایەتی (١٠).

ئەمەش جەختکردنەوەیە لە شوێنگەی جیهان و رازیبوونە پێی، چونکە بێتاوانەو باشە، خوای گەورە دروستیکردووە بۆ خێرو چاکەو رێکیخستووە بۆ مرۆڤ، لەڕاستیشدا هەرچی شتێ لەم جیهانەدا هەیە، بە خۆرو مانگیشەوە رامی کردووە بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ، هەمووی بونەوەریش شانۆیەکەو مرۆڤ کردەوەی رەوشتیی تێیدا ئەنجامدەدات، بەم پێیەش ئەوا بەشی هەرەبالا لە ویستی خوای گەورە جێبەجێ دەبێت، مرۆڤیش بەرپرسە لە چوون بەدەم جێبەجێکردنی حەزو پێویستیەکانی خۆیەوە، هەر تاکێکیش بۆ خۆی بەرپرسە لەو کارە هاوشێوەیە، مرۆڤیش لەسەری پێویستە کە توانا مرۆییەکان تا ئەوپەڕی پلەی توانایی لە هەموو خەڵکیدا گەشە پێبدات، بۆ ئەوەی سود وەربگیرێ لە هەموو بەهرە سروشتیەکانیان، لێرەوە هەمووی سەر زەوی دەگۆڕدرێ بۆ باخاتی بەرهەمهێنەرو باخچەی جوان و رازاوە، هەر لەم ئان و ساتەشدا بۆی هەیە لەکاتی پێویستدا رووماڵ و دۆزینەوە لە رۆژو مانگیشدا بکات[1]، مەعلومیشە کە ئەگەر مرۆڤ بیەوێ جیهان بکاتە بەهەشتێك کە وشەی خوای گەورە تیایدا بەرزترین و بالاترین راستی بێت ئەوا لەسەری پێویستە جیهان ئاوەدان بکاتەوە و گەشەی پێبدات.

گومانی تێدانیە ئەم جەختکردن و پێداگرتنە لەسەر ئاوەدانکردنەوەی جیهان دەبێتە هۆی داهێنانی ژیاریی، چونکە ئەو توخمانە بەدی دێنی کە دەبنە هۆی دروستکردنی ژیارەکان ، هەروەها

---

[1]- ﴿ يَـٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَـٰنٍ ﴾ الرحمن: ٣٣.

ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەش کە بۆ گەشەکردن و پەرەپێدانی پێویستن، یەکتاپەرستیش دژە لەگەڵ ژیانی رەبەنیو گۆشەگیریو نکولیکرن لە جیهان و لە دنیانەویستی [1].

جەختکردنەوە لەسەر بەهەند وەرگرتنی جیهان بەو مانایە نیە کە بەبێ هیچ مەرجێك پەسەند بێت و وەربگیرێ، ئەویش و سروشتیش هەر بەو شێوەیە لەسەر باری خۆیان بن. چونکە بەبێ بوونی پرەنسیپێك کە لەسەری پشکنین بکرێ بۆ ئەوە کە مرۆڤ بە دەستیهێناوە، ئەوا جەختکردنەوە لە گرنگیدان بە جیهان و بە سروشت بە ئاراستەی دژدا دەڕوات ئەویش بە زیادەڕۆیی کردن لە هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی یەکێك لە بەهاکان یان توخم یان هێزەکان، یان زیادەڕۆیی کردن لە کۆمەڵەیەکیاندا لە سەر حیسابی کۆمەڵەکانیتر. کەواتە پرۆسەی هاوسەنگی کردن و رێکخستنی هەوڵەکان ئەرکی مرۆڤە، تا هەماهەنگییەك لە نێوان هەموو بەهاکاندا فەراهەم بێت، ئەویش بەپێی ئەو سیستمی باشترو لە پێشترەی کە گونجاوە لەگەڵیداو داخوازیەکی لە پێشترو زەروورییە ، نەك بە پاڵنەری پەلەکردنی مرۆڤ

---

[1]- بڕوانە سورەتی الحدید: ئایەتی (٢٧)، خوای گەورە لە سورەتی القصص دا فەرمانمان پێدەدات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ﴾ **القصص:** ٧٧ فەرمانیشی بە مرۆڤ کردووە بپاڕێنەوە تا بیاندرێتیٚ ﴿ فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً ﴾ **البقرة:** ٢٠١، وە سورەتی الاعراف: ئایەتی (١٥٦ ) ، جگە لەوە خوای گەورە باوەڕداران دڵنیا دەکاتەوە کە ئەگەر ئەوان کاری چاکە بکەن ئەوا پاڕانەوەکانیان گیرا دەکات (سورەتی النحل: ئایەتی (٣٠) سورەتی الزمر: ئایەتی (١٠) .

یان سۆزداریی یان جۆش و خرۆش یان هەنگاوی کوێرانە، چونکە بەغەیری ئەم شێوازە ئەوا هەر هەولێك سەرئەنجام بە کارەسات یان سەرئەنجامێکی رووکەش تەواو دەبێ، یان هەندێك هێزی شەیتانی راستەقینە سەر دەردێنن و ئەوەی خۆیان دەیانەوێ کاری بۆ دەکەن، بۆ نموونە ژیاری ئەغریقی لە هەوڵدانیدا بەرەو جیهان زیادەڕۆیی کرد، دووپاتی دەکردەوە کە هەموو شتێك لە سروشتدا چاکەیەکی ڕووتە، لەبەرئەوە شایانی هەوڵ بۆ دان و بە دەستهێنانە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە هەرشتێك لە خۆیدا خواست و خوازراو بێت، واتە جێگای بایەخ پێدانێکی راستەقینە بێت ئەوا بە سروشتی خۆی خێروچاکەیە، چونکە خودی حەزو خواست خۆی چاکەو خێرە، بەو پێیە کە شتێکی سروشتیە، جائەگەر ئەو حەزو خواستەش دژ بێت لە گەڵ خودی سروشتدا، ئەوا بە تەنیشت ئەگەری دژ بەیەك بوونی رێرەوەکان لە وێنەی حەزو خواستەکان یان هەندێ لە توخمە سروشتیەکان لەگەڵ هەندێکی تریان، ئەوا ئەو خواستە یان توخمە بەڕادەی پێویست هێزی راکێشانی تێدا نەبووە کە سەرلەنوێ گرەنتی تێڕوانین بەگریمانەی یەکەم بدات ، کەواتە پێویست بوون بە پڕەنسیپێك کە لە دەرەوەی حاڵەتی سروشتی (خارق)بێت و سەرووتر بێت لە هەموو حەزو خواستەکانی سروشتی، وە دەکرێ لە چوارچێوەی ئەویشدا لە هەموو دژبەیەکەکان و جیاوازییەکان تێبگەین، ئەمەش مەسەلەیەکەو دەبێ دەرکی پێبکرێ، بەڵام لەجیاتی پەیبردن بەم راستییە، ئەوا ژیاری ئەغریقی کە دەستی گرتبوو بە جوانی خودی سروشتەوە ، بەجۆرێ کە

سەرئەنجامی کارەساتباری خودی ڕێچکەی سروشتی بە مەسەلەیەکی سروشتی وەرگرت، ژیاری نوێی خۆرئاوایی هەر لە سەردەمی ڕێنیسانەوە تائەوپەڕی گرنگیدا بە کارەسات، ئەو جۆش و خرۆشەی کە بۆ ڕێچکەی سروشتی نواندی لە وەرگرتنی سروشتێکی بێڕەوشتدا وای لێکرد ڕێچکەی توندڕەوی بگرێتەبەر وەك بلێی حالەتێکەو لە دەرەوەی سروشتەوەیە، جا لەبەرئەوە ململانێی مرۆڤی خۆرئاوایی ئاڕاستەی دژ بەکلێساو هەموو شتێك بوو کە وێنای کلێسای دەکرد، ئیتر ئەو پێشکەوتنەی کە لە بواری زانستدا بەدەستی دەهێنا بەو بەرهەمەی دادەنا کە رزگاربوون و دەرچوونە لە رکێفی کلێسا.

لێرەوە بۆچوونی رووت و بە تەنها جەختکردن لەسەر ئەوە کە جیهان یان ڕێچکەی سروشتی پەیوەستە بە کۆمەڵێ رایەڵەی پێوانەیی کە لە سەرچاوەی ئەقڵێکی رەهای نەتیجەگیرەوە درێژ دەبێتەوە بووەتە کارێکی زۆر زەحمەت، وەبێ ئەم رایەڵانەش، ئەوا هەردەبێ ڕێچکەی سروشتی بە دژەیەکیەکی خودیو لە ململانێ خودییەکاندا کە (لە دەرەوەی سنوری گریمانەکان) چارەسەرکردنیان ئاسان نیە کۆتایی بێت، هەروەك کۆمەڵی خواکانی (**الأولمب**) نەیانتوانی بە تەبایی لەگەڵ خودی خۆیاندا بژین، بۆیە دەبوو هەستن بە وێرانکردنی خۆیان، لێرەوە جەختکردنەوە لە جیهان لەلای خوایانی ئەغریق بێهودەییەکەو هیچی لێ سەوز نابێت.

لە ڕاستیدا تاکە گرەنتی جەختکردنەوە لە جیهان کە زەمانەتی ئەوەی بۆ بکات ژیارێکی هاوسەنگی بەردەوام و بە توانا لەسەر چاککردنی خودی خۆی بۆ فەراهەم بێنێ تەنها رەوشتەو بەس.

واقیعیش دەیسەلمێنێ کە ژیاری راستەقینە جگە لە جەختکردنەوە لە جیهان کە رەوشتی سروشتی یان هێزەێك لە دەرەوەی سروشت حوکمی تێدا دەکات شتێکیتر نیە بەجۆرێ کە ناوەڕۆکی ناوخۆیی یان راگرەکانی دژ نەبن لەگەڵ ژیان و جیهان و کات و مێژوو و ئەقڵ. دواجار دەڵێین لەنێو تەواوی ئەو رێچکە هزرییانەدا کە لای مرۆڤ ناسراوان ئەوە تەنها یەکتاپەرستییە کە ئەمجۆرە رەوشتە پێشکەش دەکات.

## یەکتاپەرستیی بەو سیفەتە
## کە یەکەم پڕەنسیپە لە یەکبوونی ئوممەت دا

یەکتاپەرستی جەختدەکات و دڵنیامان دەکات کە: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴾[1]، یەکتاپەرستیش ئەوە دەگەیەنێ کە باوەڕداران لە لەڕاستیداو بنەڕەتدا یەك کۆمەڵن و برای یەکن، لەبەر رەزامەندی خوای گەورە یەکتریان خۆشدەوێت و بەڕاستیو رەواو ئارامگرتن ئامۆژگاری یەکتری دەکەن[2]، هەر هەموویان دەستدەگرن بە ئایینی خوای گەورەوەو ناکۆك و دووبەرەك نابن[3]، پشت بەیەکتر دەبەستن و فەرمان بەچاکە دەکەن و رێگیری لەخراپە دەکەن[4].

---

[1]- بڕوانە سورەتی الانبیاء: ئایەتی (٩٢)، سورەتی **المؤمنون**: ئایەتی (٥٣).

[2]- هەروەك لە ئایەتەکانی سورەتی العصر: ئایەتی (٣)، سورەتی الحجرات: ئایەتی (١٠).

[3]- سورەتی ال عمران: ئایەتی (١٠٣).

[4]- سورەتی ال عمران: ئایەتی (١١٠)، سورەتی **المائدة**: ئایەتی (٨٢)، سورەتی **التوبة**: ئایەتی (١١٣) ، سورەتی **طه**: ئایەتی (٥٤ و ١٢٨).

سەرئەنجامیش گوێڕایەڵی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەبن[1].

دیدو تێڕوانینی ئەم ئوممەتە یەك دیدو یەك تێڕوانینە، هەروەها هەست و ئیرادەو کردارەکانیشی بە هەمانشێوەیە، ئوممەتیش پێکدێت لە کۆمەڵێکی رێکخراو لە مرۆڤ و راگری گردبوونەوەکەشیان ئەم سێ پایە پێکەوە گرێدراوەیە ئەوانیش: عەقڵ و دڵ و بازووە، هەروەها جۆرێك لە رێککەوتن و تەبایی لە هزرو بڕیارو هەڵوێستیاندا هەیە، لە کەسایەتیو لە بازووشیاندا بە هەمانشێوەیە، ئوممەت برایەتیەکی گشتگیرەو لاناکاتەوە بەلای رەنگ یان ناسنامەی رەگەزییەوە، جا لە سنوری ئەم تێڕوانینەدا ئەوا هەمووی خەڵکی یەکسانن و بە پارێزکاری و لەخواترسان نەبێت کەسیان لە کەسیتریان چاکتر نیە[2]. ئەگەر یەکیك لە تاکەکانی ئەو ئوممەتە زانست و شارەزاییەکی نوێی بەدەستهێنا ئەوا ئەرکی سەرشانیەتی کەسانیتریش فێر بکات، وە ئەگەر یەکێکیان رزقێك یان ئاسودەییەکی بەدەستهێنا ئەوا دەبێتە ئەرکی کە ئەندامانیتری ئەم ئوممەتە بەشداری بکەن تیایاندا، وە ئەگەر کەسێکیان گەیشتە پلەو پایەیەك یان سەرکەوتن یان خۆشگوزەرانیەك ئەوا ئەرکی سەرشانیەتی

---

[1] –هەروەك خوای گەورە لە سورەتی ال عمران دەفەرموێ: ئایەتی (٣٢ و ١٣٢)، سورەتی النساء : ئایەتی (٥٨)، سورەتی **المائدة**: ئایەتی (٩٥)، سورەتی النور: ئایەتی (٥٤)، سورەتی محمد: ئایەتی (٣٣)، سورەتی النغابن: ئایەتی (١٢).

[2] - هەروەها لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە باس لەحەجیماڵئاوایی دەکات، مەبەستیشمان بە کۆدەنگی سیانەیی واتە یەکسانبوونی (دید یان زەین یان بیرکردنەوە)، وە رێکەوتنی (ئیرادە یان بڕیار یان مەبەست)، وە رێکەوتنی (کردار یان بازووە مرۆییەکان)ە.

هاوکاری کەسانیتریش بکات، تا دەگەنە ئەو ئاستەی کە خۆی پێیگەیشتووە[1].

لەبەرئەوە بەبێ بوونی ئوممەت یەکتاپەرستی بوونی نابێت، چونکە ئوممەت هۆکاری شارەزابوون و رەوشتە، جێنشینبوونی مرۆڤە (لەزەویدا)و جەختکردنە لە جیهان، ئوممەت سیستمێکی گەردوونیو گشتگیرەو تەنانەت خەڵکانی بێباوەڕیش دەگرێتەوە، ئەویش سیستمی ئاشتییە، واتە ئاشتی ئیسلام، کە بەردەوام کراوەیە لە بەردەم هەموو ئەو تاك و کۆمەڵانەدا کە باوەڕیان بە پرەنسیپی قەناعەت پێکردن و قەناعەتکردن بە راستێتی هەیە، دەگەڕێن بەدوای سیستمێکی جیهانیدا کە هزر و شمەك و سامانەکان و خەڵکی ئازادبن لە جووڵەکردن و گواستنەوەدا. ئاشتی ئیسلامیش سیستمێکی جیهانییە زۆر سەرکەوتووترو باڵاترە لە سیستمی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە دوێنێ نزیکدا لەدایکبووە، ئەو سیستمەی کە پرەنسیپەکانی ئوممەت ـ دەوڵەت بە زاڵبوونی (زلهێزەکان) خراپیان کردوو لەباریان برد، هەردووکیشیان لە پێکهێنەرەکانی ئەو سیستمەن، ئەو پرەنسیپانەش بە دەوری خۆیان لەسەر (سەروەریی نیشتمانی)دادەمەزرێن کە لەسەردەمی سەلاحەددینی ئەییوبی لەلایەن مێژووی هزری ئەورووپییەوە دەرچووە، هاوکات نەمانی ئاکارە باڵاکان لە کۆمەڵگای جیهانیدا کە

[1]- پێغەمبەری نازدار ﷺ موسڵمانان وێنا دەکات بە دیوارێکی رێك کە خشتەکانی یەکتر دەبەستنەوە، وە بە جەستەیەك کە ئەگەر پارچەیەکی ئازاری هەبوو پارچەکانیتر لەگەڵیدا ئازار دەچێژن.

کڵێسا بە ساردو سرپەکەوە بانگەشەی بۆ دەکرد. بەڵام سەروەریی نیشتمانی لە ناوەڕۆکیدا لەسەر ڕێژەیی ڕەوشت و بەهاکان دادەمـەزرێ.

سەرکەوتنی نەتەوەیەکگرتوەکان لەوەدا دەردەکەوێ کە هەستێ بە بینینی ڕۆڵی نەرێنی و ڕێگریکردن یان وەستانی شەڕ لەنێوان ئەندامەکانیدا، تا ئێرەش وا دەردەکەوێ کە ئەو سیستمە دەستەوسانە لەوکارەدا، چونکە سوپایەکی بەخۆی نیە، مەگەر لە کاتێکدا نەبێ کە ئەندامانی (زلهێزەکان) لە ئەنجومەنی ئاسایش ڕێکبکەون لەسەر ناردنی سوپا بۆ مەبەستێکی دیاریکراو، بەڵام لە ئیسلامدا بە پێچەوانەوەیە چونکە ئاشتی ئیسلامی لە دووتوێی دەستورێکی هەمیشەییدا دانراوە ئەویش لەسەر دەستی پێغەمبەری سەروەر ﷺ لە ڕۆژانی یەکەمی کۆچکردنیدا لە مەدینەی منەووەرە.

پێغەمبەری بەرێز ﷺ ئەم دەستورەی وەها دانا کە جولەکەکانی مەدینەو مەسیحیەکانی خەڵکی نەجرانیش بگرێتەوە و ناسنامەیان بپارێزێ، هەروەها دامەزراوە ئایینی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریەکانیشیان بپارێزێ، لە مێژووشدا نەزانراوە کە دەستورێکی تری نوسراو هەبێت ڕێز لە کەمینەکان بگرێت وەها کە دەستوری دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە ئەنجامیداوە.

دەستوری مەدینە بۆ ماوەی چواردە سەدەی رابردوو لە وڵاتە ئیسلامیە جۆراوجۆرەکاندا کاری پێدەکرا، خۆڕاگر بوو لەبەردەم کەسە ملهوڕو شۆڕشە نەیارەکانیدا بە هەموو شێوە جۆراوجۆرەکانیەوە، لەنێویشیاندا جەنگیزخان و هۆلاکۆ.

کەواتە ئوممەت، بە تەنیشت ئەوەوە کە سیستمێکی کۆمەڵایەتییە سیستمێکی جیهانیشەو بناغەی ژیاری ئیسلامییە، مەرجێکیش هەیە کە هەردەبێ ببێ، ئەویش وێناکردنی ئەقڵی مرۆییە لە خودی (حيّ کوڕی یقظان) و لە سەرگوزەشتەی ڕێکردنی ژیریەکەیدا. فەیلەسوفەکان ئەوەیان دۆزییەوە کە حيّ کوڕی یقظان بە هەوڵ و کۆششی تایبەتی خۆی گەیشتە دۆزینەوەی راستێتی ئیسلام، وە گەیشتنی بە یەکتاپەرستیی کە کرۆکی ئەم ئیسلامەیە، لە دوای ئەوەشەوە بووە ئەرکی حيّ کوڕی یقظان کە دەبێ داهێنان یان دۆزینەوەی (ئوممەت) بگرێتەبەر، لەبەرئەوە هەستا بەلەمێکی لە قەدی درەختێکی داڕوخاو دروستکردو پێی رۆیشت بۆ قوڵاییەکانی دەریاو بەدوای ئەو (ئوممەتە)دا دەگەڕا کە بەبێ بوونی ئەو ئوممەتە ئەوا تەواوی زانیاری و شارەزاییەکانی نەگونجاون لەگەڵ راستی دا. دواجار بەیەك وشە گوزارشی لێدەکەین کە یەکتاپەرستیی بریتیە لە (ڕێبازی ئوممەت).

## یەکتاپەرستیی بەو سیفەتە
## کە بناغەی یەکەمە لە زانستی جوانیەکاندا

یەکتاپەرستیی ئەو مانایە بەدەستەوە دەدات کە خوایەتی لە تەواوی گۆڕەپانی سروشت دووربخرێتەوە، هەرچی لە بونەوەردا هەیەو لەوەوەیە ئەوا بەدیهێنراوە، بەرزنابێتەوە بۆ سەرووی خۆی، بەڵکو دەکەوێتە ژێر یاساکانی کات و شوێن، هیچ شتێکی تێدانیە کە بکرێ خوای گەورە بێت وە یان بە هەر مانایەکەوە بێت سیفەتەکانی خوایی بن، بە تایبەتی بەو مانا هەبووە (وجود)یە کە یەکتاپەرستیی بەو سیفەتەی کە کرۆکی تاقانەیی خوای گەورەیە نکولی لێدەکات ، خوای گەورە بە هیچ جۆر نە بونەوەرەو نە سروشتە، کەواتە ئەو باڵاترین باڵایەو بەرز و شکۆمەندە، تاکە باڵای باڵایە. یەکتاپەرستیی دووبارە جەختدەکاتەوە کە هیچ شتێك نیە لە خوای گەورە بچێت[١]، لەبەرئەوە شتێك لە بونەوەردا نیە کە بکرێ لە شێوەی خوا بێ یان هێمایەك بێت بۆ خوای گەورە، هیچ شتێکیش لە توانایدا نیە نوێنەرایەتی ئەو بکات، بە حوکمی پێناسەکردنیش خوای گەورە لەوە دوورترە کە وێنا بکرێ، کەواتە خوای گەورە ئەو زاتەیە کە هیچ داهێنانێکی جوانی ئیتر لە هەر ئاستێکدا بێت لە توانایدا نیە وێنای بکات.

---

[1]- بڕوانە سورەتی الشوری: ئایەتی (١١).

مەبەست بە بەهرەو شارەزایی جوانییەتی واتە پەیبردنە بە کرۆکی بنچینەیی (**البدئي**) میتافیزێکی لە ڕێگای هەستەوەرەکانەوە. بەجۆرێ ئەو کرۆکە ببێتە پڕەنسیپێکی پێوانەیی بۆ شتی بینراو، ئەوکات دەبێ ئەو شتە لە سەر ئەو بارەی بێت کە پێویستە، وە هەتا شتی بینراو نزیکتر بکەوێتەوە لە کرۆك ئەوا زیاتر جوانتر دەبێت، وە لە حاڵەتی زیندوویی سروشت و رووەك و گیانداردا ، بە تایبەتیش لە حاڵەتی مرۆڤدا، ئەوا شتە جوانەکە ئەو شتەیە کە تائەوپەڕی نزیکبوونەوە کە لە تواناادا بێت نزیکتر دەبێتەوە لە کرۆکی بنچینەیی، بە جۆرێ وا لەو تواناداره بکات حوکم دەربکات کە ئەگەر وتی بە راستی سروشت بە شێوەیەکی قەشەنگ رەوانبێژیی خۆی لەو شتە جوانەدا دەرخست ئەوا حوکمەکەی پێکا بێت. لە راستیشدا شتی جوان ئەو شتەیە کە سروشت دەیەوێ گوزارشی لێبکات.

بە دەگمەنیش بتوانێ لەنێو ئەو هەموو عەیبەو کەموکوڕییەیدا ئەو کارە بکات، هونەر پڕۆسەیەکە هەوڵدەدات ئەو کرۆکە میتافیزیکیە لەنێو شروشتدا بدۆزێتەوە تا لە شێوەیەکی بینراودا وێنای بکات. شتێکی روونە کە هونەر لاساییکەرەوەی سروشتی دروستکراو نیە ، هەروەها نواندنی هەستیی نیە لەبۆ سروشتی (چەسپێنراو)، واتە ئەو شتانەی کە بە سروشتبوون یان واقیعی سروشتییان کامڵ بووە. لەوانەیە نواندنی فۆتۆگراف بەو سیفەتە کە هۆکارێکی روونکردنەوەیە یان بۆ مەبەستی بڕواپێکردنە یان بۆ سەلماندنی ناسنامەیە بەهایەکی هەبێت ، بەڵام لە پێوانەی کاری هونەریدا هیچ بەهایەکی نیە، هونەر ئەوەیە کە توخمێکی

غەیرە سروشتی بخەیتە نێو سروشتەوە، وە شێوەیەکی بینراو بەو توخمە ببەخشی کە گونجاوە لە گەڵیدا.

جا هەروەك پێشتر وەسف و شیکار کرا، دەبێ هونەر بە زەرووری شتێك بخاتەنێو سروشتەوە کە پێشتر نەبووبێ تیایدا، ئەو شتەش کە لە سروشتدا بوونی نەبێت بریتیە لە شتێکی هەرەبەرزو باڵا، لێرەوە ناتوانرێ غەیرە خوایی ئەو جۆرە وەسفەی بەسەردا بچەسپێ، بەتەنیشت ئەمەشەوە وە لەبەرئەوە کە کرۆکی بنچینەیی بابەتی چێژ وەرگرتنی جوانییە ئەوا دەکرێ هەڵگری وەسفی پێوانەییو جوانیی بێت، چونکە سۆزەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی تایبەت کاریگەر دەبن پێی. لەبەرئەمەش ئەوا خەڵکی شتی جوانیان خۆشدەوێو دەکەونە ژێر هەژموونیەوە. وە مادامێ خەڵکی جوانیی لە سروشتی مرۆییدا دەبینن ئەوا توخمی بنچینەیی کە لە حاڵەتی مرۆییدا زاڵترە لە سروشتەوە بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی بەرزو باڵا. ئەمەش دەقاودەق ئەو شتەیە کە ئەغریقیەکان ناویانبردوە بە (خوایی کردن) یان گۆڕینی مرۆیی بۆ خوایی، مرۆڤیش بە شێوەیەکی تایبەت مەیلی بەلای پەرستنی ئەو جۆرە مرۆڤانەدا هەیە کە گۆڕدراون و بەخوایان دەزانن. کاتێ کە کارەکەش لای مرۆڤی خۆرئاوایی نوێ پەیوەند دەبێ بە کاروبارەکانی ئەودیو سروشت (میتافیزیکی) ئیتر زۆر ئارام ناگرێ لەسەر هەر خوایەك لە خواکان، بەڵام کاتێ مەسەلەکە پەیوەند دەبێت بە رەوشت و رەفتارەوە، ئەوا ئەو (خوایانە)ی کە لە بەرئەنجامی بە گەورە زانینی

هەستەکان و خواست و حەزە مرۆییەکانەوە دروستیان دەکات ئەوانەن کە لە واقیعدا حوکم دەکەن بەسەر کردارەکانی مرۆڤدا.

ئەمەش ئەو هۆکارە راڤە دەکات کە دیارترین کارو چالاکیەکانی جوانیی لەلای ئەغریقەیە دێرینەکان بریتی بوو لە گرنگیدان بە هونەرەکانی نواندنی خواکان لە وێنایەکدا کە توخم و سیفەت و هەستە مرۆییەکان بە شکۆمەند رابگرێ، ئەو گرنگی پێدانەش لە هونەرە بینراوەکاندا بەڕوونی دەبینین وەك هونەری هەڵکۆڵین، وە لە هونەرە خەیاڵ ئامێزەکاندا وەك شیعر و دراما، ئەو شتانەش کە— واتە خواکانیان - وێنایان دەکردن جوان بوون، چونکە ئەوە بە شکۆمەند راگرتنی ئەو شتانە بوو کە دەبێ سروشتی مرۆیی لەسەری بێت، بەڵام ئەو جوانییە ئەو ململانێ ریشە قووڵ و داکوتاوەی نەشاردبووەوە کە لەنێوان هەریەك لە خواکان و نێوان خواکانی تردا هەبوو. هۆکاری ئەمە ئەوەبوو کە هەریەك لەوانە شتێکی راستەقینە بوو لە سروشتداو بەرزکرابوویەوە بۆ ئاستی خوایەتی کە گوایا سروشتی بەزاندووە.

لە رۆمادا، کە شانۆی دارمانی ئەغریقیەکانە، هونەری تاشین و هەڵکۆڵینی بەهاداری ئەغریقی دابەزی بۆ وێناکردنی ئەزموونی واقیعی هەموو ئیمپراتۆرە جۆراوجۆرەکان، تەنانەت لەوێیش، ئەم وێنەگرتنە بەبێ بەخواکردنی ئیمپراتۆرەکان سەری نەدەگرت، لەلای ئەغریقیەکان، کە بۆ چەندین سەدە تیۆرەکە بە پاکی مایەوە، بە تەنیشت تاشین و هەڵکۆڵینەوە هونەری دراما گەشەی کرد ئەویش بەمەبەستی وێناکردنی ئەو دژایەتی و ناکۆکییە ئەزەلیانەی نێوان خواکان لە رێگای پیشاندانی

زنجیرەیەك لە ڕووداوەکان، کەسایەتیەکانی نێو دراماکە دەچوون بەناویەکدا، کۆی مەبەستەکەش هەر وێناکردنی ئەو کەسایەتیە خواییانە بوو کە بە دڵنیاییەوە بینەران دەیانزانی ئەوانە کەسایەتی مرۆیین، بەڵام لە هەمانکاتدا بووبوونە سەرچاوەی لەزەت و ڕابواردنێکی گەورە، جا ئەگەرچی ئەو ڕووداوە دراماییانەی کە لە بەرچاویاندا دەکەوتنەڕوو و دەبوونە هۆی کۆتاییەکی کارەساتبار، ئەوا هەر وەك زەرورەتێك و سەلمێنراوێ دەبینران، ئەو زەرورەتەش هەموو ئەو ئازارانەی لادەبرد کە کارەساتەکان بەجێیان دەهێشت، وە لە ڕێگای پڕۆسەی (پاککردنەوە) ئەو ئازارانەی پاڵ پێوەدەنا کە لەبەرئەنجامی ئەو کردەوەو هەڵسوکەوتە ناڕەوشتیانەوە کە ئەنجامیانداون هەستیان پێدەکرد ، جا لەبەرئەوە ئەوا هونەری کارەساتبار ـ کە لە وڵاتی ئەغریق دا لە دایکبوو و کامڵ بوو ـ دادەنرێ بە ترۆپکی هونەرە ئەدەبیەکان هاوکات لە تەواوی لێکۆڵینەوە مرۆییەکانیشدا، لێرەوە لە حاڵەتێکی دەگمەندا لە داننان بە راستی خۆرهەڵاتناس ج. ی. فون کرونباوم (g.e.von grunebaum) دەڵێ: (ئەوی ڕاستی بێت ئیسلام ئاشنا نەبووە بە هونەری دەستنیشانکردنی کەسایەتی (تشخيصية) واتە: (هەڵکۆڵین و نیگارکێشی و دراما) چونکە ئیسلام هیچ جۆرە خوایەکی بەرجەستەکراو یان حاڵەتێکی وای لە سروشتدا تێدا نیە، خوایانێك کە چالاکیەکانیان هەر بریتی بووە لە ململانێی هەندێکیان

لە گەڵ هەندێکی تریان یان لەگەڵ مرۆڤەکاندا)[١]، مەبەستی (فون کرونباوم) لەم گوتەیەی سەرزەنشتکردنی ئیسلام بووە، بەڵام ئەو گوتەیەی لەڕاستیدا یەکەمین تایبەتمەندیی جیاکار بۆ ئیسلام پێکدەهێنێ. شکۆمەندیی ناوازەی ئیسلام ئەوەیە کە تەواو خاڵییە لە پەرستنی بتەکان. وە لە هەرجۆرە تێکەڵاوکردنێ لەنێوان بەدیهێنراو و بەدیهێنەردا. بەڵام گوتەی ئەم پیاوە هەر راست و دروستە، چونکە لە خۆرئاوا پەیوەندی گەرموگوڕ لەنێوان هونەرەکانی دەستنیشانکردن و ئایینە بتپەرستەکان و خوایەتی بەرجەستەکراودا هەیەو دەردەخات.

جولەکە پێشتر جەختیان کردووتەوە کە بەرزو باڵایی‌و شکۆمەندیی خوا هەرجۆرە (وێنەیەکی تاشراو و هەڵکۆڵراو) لەخۆی دووردەخاتەوە، خۆیشیان پابەندکرد بە گوێڕایەڵیکردنی ئەو فەرمانە خواییە، وە بۆ مێژوویەکی تەواو بەتەواوی جۆرە پاشەکشەیەکیان کرد لە هەر هونەرێك لە هونەرە بینراوەکان[٢]، دواتر بە کاریگەری میسر و ئەغریق و رۆما و جیهانی مەسیحی هەستان بە بەرهەمهێنانی هەندێ کاری هونەری کەم، لە سەردەمە نوێیەکانیشدا، بەتایبەتی لەوکاتەوە کە لەسەر دەستی نابلیۆن رزگارکران و تێکەڵاو بوون بە ژیاری خۆرئاوایی، دەیانبینین کە وازیانهێناوە لە هەڵوێستە بەرزو باڵا یەکەمەکەیان ئەویش لەو پێناوەدا تابچنە نێو رێچکەی سروشتیی خۆرئاوایی.

---

[1]- بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم مەسەلەیە بڕوانە: إسماعيل الفاروقى (**الإسلام و الفن**).

[2]- بڕوانە: (حول **طبيعة العمل الفني الديني**) **إسماعيل الفاروقي** .

لەڕاستیدا یەکتاپەرستیی دژ نیە بە داهێنانی هونەری، یان بە لەزەت بردن لە جوانی، بەڵکو بە پێچەوانەوە پیرۆزبایی لە جوانی دەکات و هانی دەدات، یەکتاپەرستیش جوانی رەها تەنها لە خوای گەورەدا دەبینێ وە لە ئیرادەو گوتە دابەزێنراوە پیرۆزەکانیداو بەس، یەکتاپەرستیی لەم پێگەیەوە مەیلی بەلای دۆزینەوەی هونەرێکی نوێدایە کە گونجاو بێت لەگەڵ تێڕوانینەکەی خۆیدا، وە هەر لە سەرەتای گوتەی (جگە لە خوای گەورە هیچ خوایەکی تر بوونی نیە ـ لاإله إلا اللّه ـ ) ئیتر هونەرمەندی موسڵمان باوەڕدەهێنێ کە هیچ شتێك نیە لە سروشتدا وێنای خوا بکات یان گوزارشی لێبکات. وە لە رێگای بەکارهێنانی شێوازی کرداری گۆڕین (التحوير) هونەرمەندی موسڵمان بە پێی توانای خۆی هەوڵیداوە هەموو شتێك لە سروشت دووربخاتەوە، بەم شێوازەشی توانی شتی سروشت لە خودی سروشت دووربخاتەوە کە بە پلەیەکە بەزەحمەت جیابکرێتەوە، شێوازی گۆڕین لە دەستی هونەرمەندی موسڵماندا بوو بە ئامڕازی نێگەتیڤ کە بەوە دەڵێ: (نا) بۆ هەر شتێکی سروشتی، بەڵکو بۆ خودی بەدیهێنراویش، وە بە نکولیکردنی رەهای بۆ سروشتی شتەکان، ئیتر موسڵمان بەشێوەیەکی بینراوو بەشێوەی نێگەتیف گوزارشی لە حوکم دەکرد کە (أن لا إله إلا الله)یە، لەڕاستیدا ئەم شایەتیەی هونەرمەندی موسڵمان بەرانبەرە بە نکولیکردن لە بەرزو باڵایی سروشت.

هەروەها هونەرمەندی موسڵمان لەو سنورەدا نەوەستا، بەڵکو کاتێ بۆی ڕوونبویەوە کە گوزارشت کردن لە خوا لەڕێگای شێوەو وێنەیەکەوە لە شێوەکانی سروشت کارێکەو جیاوازە لە گوزارشت کردن لە مەحاڵی گوزارشت کردن لە بەدیهێنەر بە خودی ئەو شێوەیە ئیتر دەستکەوتی داهێنانەکەی جێبەجێ بوو. پەیبردن بەوە کە هەرگیز ناتوانرێ بە بینین گوزارش لە خوای گەورەو باڵادەست بکرێ، کە ئەوە باڵاترین ئامانجی جوانییە لەبەردەم مرۆڤدا، خوای گەورەش زاتێکی کامڵ و رەهاو باڵاو شکۆمەندە، ئەو گوتەیەش کە دەڵێ لە تواناادا نیە خوای گەورە وێنا بکرێ بە هیچ شتێك لە بونەوەردا ئەوا ئەوە باوەڕێکی جیددیە بە کەماڵ و شکۆمەندو بڵندو باڵایی خوای گەورە، بینینی خوای گەورە لە خەیاڵی مرۆڤدا لە وێنەیەکدا کە لە هیچ شتێکی ئەم بونەوەر نەچێت ئەوە بینینیەتی (بەجوانی ـ کە وێکناچێ لە هیچ جوانیەکیتر)، وە نەتوانایی گوزارشت کردن لە خوا ئەوا خودی خۆی سیفەتێکی خواییە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خوا هەتاهەتاییەو کەماڵی رەهایە، یان ناچێتە نێو شێوەوە و سنوری بۆ دانانرێ، سیفەتی هەتا هەتایی و ناکۆتایی ئەوە دەگەیەنێ کە بە هەر مانایەك لە ماناکان ناکرێ و لە تواناادا نیە گوزارشی لێبکرێ.

بە پێی ئەم ڕێرەوە لە پرۆسەی هزرکاریی ئیسلامیدا، هونەرمەندی موسڵمان هات و هونەری رازاندنەوەی داهێناو گواستیەوە بۆ (نەخش و نیگاری عەرەبی ـ ئیسلامی) یان پەرکاری پێکدائاڵاو، ئەمەش نیگار کێشییەکە (پێکهاتەیەکە) بە تەنها گەشە نادات بەیەك رەهەند، بەڵکو تائەوپەری درێژ دەبێتەوە بە هەموو ئاراستەکانداو کۆتایی نیە، ئەو

شته سروشتیه که ئەم نەخش و نیگارە عەرەبیە ـ ئیسلامییە دەینەخشێنیٚ ئیتر قوماشێك یان کانزایەك یان گوڵدانیٚ بێت یان دیواریٚ یان سەقفی ناوەوە یان پایەیەك یان پەنجەرەیەك یان لاپەڕەی کتێبێك بێت دەیگۆڕیٚ بۆ تابلۆیەکی رێك وپێك و سوك و ناسك و روون و بەرچاوو بە بێسنور درێژ دەبێتەوە بە هەموو ئاڕاستەکاندا، ئەو شتە سروشتیەش لەم هونەرەدا وەك خۆی نامێنێتەوە بەڵکو دەبێتە (گۆڕدراوێکی کرۆکی)و دەچێتە بواری بینین و بەس، لە لایەنی جونکاریشەوە ئەوا لە چوارچێوەی نەخش و نیگاری عەرەبی ـ ئیسلامیدا شتی سروشتی دەبێتە پەنجەرەیەك و دەڕوانێت بەسەر شتی بێسنوردا، ئەو بینینەش کە ئاماژە دەدات بە هەتاهەتایی‌و بیٚکۆتایی بریتیە تەنها لە پەیبردن بە مانایەك لە ماناکانی باڵابوون ئەویش ئەو تاکە مانایەیە ـ وێڕای ئەوە کە بەشێوازی نێگەتیڤە ـ کە هەرجۆرە نواندنێکی هەستیی‌و هەڵهێنان دادەپۆشیٚ.

ئەمەش راڤەکردنێکە بۆ زۆربەی ئەو کارە هونەریانە کە موسڵمانان بەرهەمیان هێناون و وەسفدەکرێن بە وەسفی داماڵین و بێلایەنی، تەنانەت کاتیٚ هونەرمەند شێوەکانی رووەك و گیاندارو مرۆڤی بەکارهێناوە ئەوا شێوازێکی گرتووەتەبەر کە وەها پیشانی داون و خستونیەتەڕوو هەروەك کەسیٚ نکولی بکات لەوەی شتانێکی دروستکراو بن، هاوکات نکولی بکات لەوەی کە هیچ کرۆکێکی لە دەرەوەی سروشتەوە لەخۆیدا حەشار دابێت، هونەرمەندی موسڵمان لەم هەوڵەشیدا هاوکاری لە کەلەپووری زمانەوانی و ئەدەبی وەردەگرت، ئەم

هونەرمەندە موسڵمانە بەهەمان مەبەست پەرەیدا بە جواننوسی عەرەبی ـ ئیسلامی تابیکاتە نەخش و نیگارێکی عەرەبی ـ ئیسلامی کە سنوری دیاریکراوی نەبوەو نیە، بە شێوەیەکی نەگۆڕ درێژ دەبوەوە بەهەر ئاڕاستەیەکدا کە جواننوسەکە ویستبێتی. هەمان گوتەش بەسەر ئەندازیاری تەلارسازی موسڵماندا دەچەسپێ کە دیکۆری بەرچاوەو رووکاری بینایەکەو شوێنی سەرەکی و هێڵی ئاسۆو نەخشەی بنەڕەتی زەوییەکەی بە نەخش و نیگاری عەرەبی ـ ئیسلامی دەڕازاندەوە، یەکتاپەرستیش تاکە کۆلکەی هاوبەشە لەنێوان هەموو ئەو هونەرمەندانەدا کە باوەڕیان بە تێڕوانینی ئیسلام لەبۆ جیهان و بۆ بونەوەر هەبووەو هەیە، هەرچەندە لەڕووی جوگرافی و نەژادیەوە لەیەکتر دوور بووبن و دوور بن[١].

---

[1]- بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی پەیوەندی یەکتاپەرستیی بە هونەرەکانی ترەوە بڕوانە:
**أطلس الحضارة الأسلامية: إسماعيل الفاروقي، لويس لمياء/ الرياض/ مكتبة العبيكان و المعهد العالمي للفكر الأسلامي/ ١٩٩٨ ، الفصول / ١٩- ٢٣ الخبرة الجمالية و الفنون الأسلامية**

# باسی دووەم
# تیۆری مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزدا

ئەم توێژینەوەیە دەربارەی تیۆری مرۆڤە لە قورئانی پیرۆزدا، ئەویش پێکدێت لە پێنج بەش:

**بەشی یەکەم:** بریتیە لە : مەبەست لە **هە**بوونی مرۆڤ.

مەبەست لە **هە**بوون بریتیە لە جێنشینێتی: واتە مرۆڤ ببێتە جێنشینی خوا لەزەویدا، خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ ... ﴾ البقرە: ٣٠. واتە: (ئەی محمدﷺ ـ باسی سەرەتای بەدیهێنانی ئەو خەڵکە بکە ـ کاتی خۆی پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی فەرموو: من بڕیارم داوە کە زەوی ئاوەدان بکەمەوەو کەسانێکی تێدا نیشتەجێ بکەم! ! ... )[١].

ئەم جێنشینییەش واتاو ناوەڕۆکێکی **هە**یە، ئەو ناوەڕۆکەش بریتیە لە ئەمانەتی خوای گەورە.

---

[1]- تەواوی واتای کوردی ئایەتە پیرۆزەکان کە لەم توێژینەوەیەدا هاتوون لە (تەفسیری ڕۆشن) چاپی یەکەم: ساڵی/٢٠١٠ لە نوسینی مامۆستا بورهان محمد أمین وەرگیراون. (وەرگێڕ)

خوای پاکوبێگەرد لە قورئانە پیرۆزەکەیدا پێی ڕاگەیاندووین کە: ئەو پەروەردگارە ئەم ئەمانەتەی خستە بەردەم ئاسمانەکان و کێوەکان و زەوی، بەڵام ئەوان داوایان لێکرد کە بەزەیی پێیاندا بێتەوەو لێرەوە نەچوونە ژێر هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە قورسە، بەڵام مرۆڤ چووە ژێر ئەو کۆڵە قورسە، ناوەڕۆکی ئەو ئەمانەتەش بریتیە لە ڕەوشت، لەکردەوەی چاك، لەباڵاترین پلەی چاکەکاریی، ئەوەتا خوای گەورە لە پەڕاوە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًاۚ... ﴾ الملك:٢. واتە: (هەر ئەو زاتە خۆی مردن و ژیانی دروستکردووە، لەناوچوون و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوەو دەربکەوێت کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە، نەك تەنها چاك و پەسەند ـ دیارە خوای گەورە دەیەوێت بەندەکانی پێشبڕکێ بکەن لە چاکەخوازیدا ـ ...).

**بەشی دووەم:** پەیوەندە بە پلانی جێبەجێکردنی ئەم مەبەستەوە.

پلانەکەش ئەمەیە: خوای گەورە بەهرەو لێهاتوییە خۆڕسکەکانی لە زوبان و زمان و دوولێو و پارچە کاراکانی جەستە، لە دڵێکیش کە دەتوانێ پەی پێببات، لە عەقڵێش کە بیردەکاتەوەو چاك و خراپ لەیەك جیادەکاتەوە بە مرۆڤ بەخشیوە، فێردەبێ‌و فێریش دەکات، وە توانابوونی لەسەر کارکردن هەیە، تا لە دنیادا پارچەکان بخاتەکار، هاوەکات لێهاتوویی ئەوکارەشی هەیە، خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا هەموو ئەمانەی ناوبردووە بە پرۆسەی ملکەچبوون

(التسخير). بەمشێوەیە ئەوا سەراپای ئەم دنیایە لە مانگ و خۆرو گیاندارو ڕووەك و کێوو ڕووبار، ملکەچن بۆ کارکردنی مرۆڤ، لەباریشن بۆ کار لەسەرکردنیشیان.

ئەم پلانەش دوو مەترسی لەخۆ دەگرێ: ئەم دوو مەترسیەش هەردەبێ ببن و وابەستەن بە ئازادی مرۆڤەوە، چونکە دەکرێ مرۆڤ بە هەموو ئەو بەهرانەوە کە پێی بەخشراوە هەر لەپرۆسەی ناسینی خوای گەورەدا بچێت بە هەڵەدا، هاوکات لە توانایدایە ـ کە ئەمەش واتای ئازادی رەوشتییە ـ سەرپێچی بکات و یاخی ببێت، جائەگەر هەڵەیکرد یان سەرپێچیکرد ئەوا هەردەبێ راستکەرەوەیەکی هەبێت، راستکردنەوەی هەڵەش لەڕێگای وەحییەوە دەبێ، لە گوفتارو فەرمان پێکردن و ڕێگریکردن کە خوای گەورە ناردوویەتە خوارەوە، لە حەڵاڵ و حەرام، راستکردنەوەی سەرپێچی و یاخیبوونیش لەڕێکای باوەڕو هیدایەتەوە دەبێ.

جا وێڕای بوونی ئەم مەترسییە ئەوا مەبەستەکە هەر ئێجگار گەورەیەو زۆر زۆر گرنگە، بۆیە هەردەبێ مرۆڤ هەستێ بە جێبەجێکردنی، چونکە جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە واتای جەختکردنەوە لەسەر بوونی ژیان دەگەیەنێ، هاوکات چەسپاندنی ئیرادەی خوای پاکوبێگەردە، پەروەردگارمان فەرمانی پێکردووین بە کارکردن، چونکە کارکردن و بەرهەمهێنان پەرستشە، بەتایبەتی ئەگەر تەبابوو لەگەڵ ئەو وەحییەدا کە خوای گەورە ناردوویەتە خوارەوە، لە فەرمانکردن بە دادپەروەریی‌و چاکەکردن و زەکاتدان و برایەتی.

ئەو کارکردنەش سەرئەنجام ئاوەدانی بەدوای خۆیدا دەهێنیٚ، ئاوەدانییەك کە لە بەهای بەدیهێنراوەکە زیاد دەکات، لە بەهای دنیا زیاد دەکات و دەیڕازێنێتەوەو جوانی دەکات.

خوای پاکوبێگەرد ئەم بونەوەرو دنیایەی بە جوانترین شێوە رازاندوەتەوە، بەڵام لەسەرووی ئەم رازاندنەوەیەوە ، ئەوا رازاندنەوەی کارو کردەوەو باڵاترین پلەی چاکەکارییە لەلایەن مرۆڤەوە.

ئەم کارە رەوشتەییەش کە دەبێتە هۆی رازاندنەوەی دنیاو بەهای لەلای خوای گەورە زیاد دەکات چەند مەرجێکی هەیە، گرنگترینی ئەو مەرجانەش بریتیە لە جیهانیبوونی کارو کردەوەو ئاڕاستەکەی، پەروەردگار لە پەڕاوە پیرۆزەکەیدا پێمان دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ ﴾ الحجرات: ١٣. واتە: (ئەی خەڵکینە ـ لە هەموو زەمان و زەمینێکدا ـ ئێمە هەمووتانمان لە نێرو مێیەك دروستکردووەو ـ کە باوکە ئادەم و دایکە حەووایە، پاشان بە تێپەڕبوونی زەمان ـ کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرەو هۆزی جیاواز ـ لەڕووی رەنگ و زمان و داب و نەریت و...تادوایی ـ تا پردی پەیوەندی لەنێوانتاندا دروست ببێت و یەکتر بناسن و هاوکاری یەکتر بن، جا لەڕاستیدا بەرێزترینتان لای خوای گەورە ئەوانەن کە زیاتر خواناسن، زیاتر خۆیان لە حەرام و گوناهو خراپە دەپارێزن، زیاتر خزمەتگوزارن...).

خوای گەورە پێمان دەفەرموێ کە هەموو ئێمەی لە یەك رۆح دروستکردووە ـ کە هەردەبێ لەژیانماندا بەرپای بکەین ـ ، ئەمەش جۆرێ لە دژایەتیکردنی بۆ دەمارگیرییو نەتەوەپەرستیو هۆزگەرایی تێدایە بەهەموو شێوەکانیانەوە، چونکە هەرهەموویان لە دەمارگیریی نەفامییەوە سەرچاوە دەگرن.

جائەگەر بەمشێوەیە مرۆڤ هەستا بەم کارە بونیاتنەرو ئاوەدانکارانە واتە لەسەر بناغەی باوەڕبوون بە خوای گەورە ئەویش بەخۆشویستنی لەڕێگای پەرستشکردنەوە بۆیو جێبەجێکردنی فەرمانکردن بەچاکەو رێگیریکردن لە خراپە، وە لەسەر بناغەی جیاوازی نەخستن لەنێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکیتردا، ئەم کارەیشی کارێکی بەرپرسانە بێت، واتە مرۆڤ بە نەفەسێکی بەرپرسانەو بە بەرپرسیەتیەکی خودی و کەسێتی تایبەت بەخۆی بچێتە ژێری، ئەوا لەدنیاو لەقیامەتدا پاداشتی ئەوکارە بەرپرسانەیەی خۆی وەردەگرێت، لەم لێپێچینەوەیەشدا ئەوا یان پاداشتەکەی بەهەشت و خۆشنودییە وە یان ئاگرو دۆزەخە.

ئەگەر بەمجۆرەش بێت ئەوا مرۆڤ گەورەترین پلەوپایەی بۆ دەستەبەر دەبێت کە مێژوو بە خۆیەوە بینیبی ، چونکە تیۆرەکانی مرۆڤ لە مێژوودا ژمارەیان کەمە، ئەوانیش چوار جۆرن: مەسیحیەت و بوذی هاوبەشن لە یەك جۆریدا، ئەویش دەستەبەرکردنی ئاستی رێزگرتنیانە لە مرۆڤ و لەم بونەوەرە.

باوەڕی بوذی دەیوت: بە دڵنیایی کە ژیان تەنها خراپەیە، بونەوەریش هەر خراپەیە، بۆیە هەردەبێ خۆمان رزگار بکەین لە

هەردووکیان، ئیتر لەم گۆشەنیگایەوە باوەڕی بوذی نەیتوانی ئاوەدانی بونیات بنیَ، یان بتوانیَ کەلتوورو ژیارێك بێنێتە بوون، بەڵکو بەتەنها جووڵەیەکی کەسایەتی تاك بوو کە ئومێد بەخش بوو بۆ خاوکردنەوەی دەماری ئەوانەی کە شوێنکەوتەی بوون. مەسیحیەتیش لەم کارەدا هاوبەشە لەگەڵ باوەڕی بوذیدا، بەڵام ئەم بۆچوونەیشی لەسەر رای بوذییەکان زیاد کردووەو دەڵیَ : (خوای پەروەردگارو باڵادەست ویستی کە مرۆڤ لە داڕوخانێکی حەتمی لەوەی کە ئادەم ـ سەلامی خوای لەسەر بێت ـ کردی) رزگار بکات، پاکوبێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی کە دەیڵێن.

واتە خوای گەورە ـ وەها کە ئەمان دەیڵێن ـ خۆی بەرجەستە کردو دابەزییە سەر ئەم زەوییە تاخۆی بمریَو ببێتە قوربانی وەك هەوڵێك لەخواوە بۆ بە بێتاوان دەرکردنی مرۆڤ لەو هەڵەو سەرپێچییەی کە کردی، لێرەوە مەسیحیەکان وتیان یان بڵێین وا خۆیان راچڵەکان کە جۆرە مرۆڤێکن باڵاترن لە مرۆڤ، چونکە خوای گەورە بە خۆشویستنێکی وەها خۆشی ویستوون کە زەرورەتێکن و نابیَ بێنیاز بێت پێیان ـ پاکوبێگەردی بۆ پەروەردگار لەوەی کە دەیڵێن ـ .

ئەمانە ئەمە گوتەیانەو ئەمە بۆچوونیانەو ئەمەش ئیدیعایانە، ئەمجۆرە بیرکردنەوەو جۆرە سروشتە باوەڕی بەوە نیە کە مرۆڤ هەستیَ بە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوە، چونکە ئاوەدانی تێکدەشکێنیَ، ئاوەدانی دەڕوخێنیَ، هاوکات پێگەو پایەی مرۆڤ و شان و شەوکەتی مرۆڤ تا ئەوپەڕی بەرزدەکاتەوە، ئەم بیرکردنەوەیە بوار دەڕەخسێنیَ

بۆیان تا بکەونە ملهوڕی کردن و خۆ بەزلگرتن و ژێردەستە خستنی مرۆڤەکانیتر.

جا لەبەرئەوە کە ئەم بۆچوونە فشارێکی ئێجگار قەبەی لەسەر مەسیحیەت دروستکرد ـ هەروەك لە سەردەمی رێنیسانس و سەردەمی رۆشنگەریىدا دەبینراو ئاشنا بووین پێی ـ ئیتر مەسیحیەکان کەوتنە لابردنی شوێنەواری ئەم بۆچوونە لە ژیانیاندا، لێرەوە کەوتنە بانگەشەکردن بۆ دنیایەکی سیکۆلاریزم کە ئایینی تێدا نەبێت، ئەم سیکۆلاریزمەش ـ لەو دیدگایەوە هات ئەو رەوشتەی کە لەسەر پێگەی ئایین بونیاتنراوە لە بازنەی چالاکی ژیانی خۆی دووریخستەوە ـ ئیتر شتێکیتری لانەمایەوە کە جەختی لەسەربکات و پشتی پێ‌ببەستێ جگە لە چێژ وەرگرتن و چاوچنۆکیی ماڵ وێرانکەر.

سیکۆلاریزم هەستایە سەرڕێ‌و کەوتە بانگەشەکردن بۆ شوێنکەوتنی چێژو لەزەت وەرگرتن، وە لەپێناو دەستخستنی چێژ، کەوتە زیادکردنی بەرهەمی ماددی بۆ گەیشتن بەو چێژە، بەمشێوەیە شوێنکەوتووانی ئەو تیۆرە هاتن بەهای خۆیانیان داڕوخان، مرۆڤیان بردە ریزی ئاژەڵ، ئا ئەوەتا ئەمڕۆ لەبەرئەنجامی پەیڕەوکردنی فەرمانڕەوایی سیکۆلاریزم کە خۆیان کردیانە دەستەڵات بۆ خۆیان دەیانبینین کە لەوپەڕی چەرمەسەریدا دەژین، ئەم تیۆرە بۆ دەستخستنی ماددە مرۆڤی کردە ئاژەڵێکی خۆپەرستی چاوچنۆك ، جا لەپێناو گەیشتن بەو ماددەیە رێگای بەخۆیدا تالان و بڕۆ دزی‌و کوشتن ئەنجامبدات، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو ئەو ماڵ و سامانەو ئەو ژیانەو ئەو

سوكايەتیكردنە بەرانبەر بە كەسێك بێت كە كوڕی نەتەوەو نەژادو هۆزەكەی خۆی نەبێت.

سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە هیدایەتی داین بۆ سەر ئیسلام كە ئەگەر ئەو زاتی پەروەردگارە نەبووایە ئەوا بێ هیدایەت دەبووین و هەر لە گومڕاییدا دەژیاین.

ئایینی ئیسلام تیۆرێكی جیهانی تایبەت بەخۆی بۆ مرۆڤ پێیە، مرۆڤ دڵنیادەكاتەوە بە چاكیو پاكیو بە بێتاوانی ئەو ژیانە، ئینجا داوا لە مرۆڤ دەكات لەبۆ گوێڕایەڵیكردن و خۆشەویستی خوای گەورە كاربكات، ئەو جۆری كارەش لێی داوا دەكرێت بریتیە لە گەیشتن بە باڵاترین پلەی چاكەكاری، جۆری كردەوەی ویستراو بریتیە لە ئاوەدانكردنەوەی دنیا، دەبێ ئەو ئاوەدانكردنەوەیە لەسەر بناغەی دادپەروەرییو برایەتی بێت تا ئەم دنیایە واتە سەراپای مرۆڤایەتی ببێتە بەهەشتێك كە ناوی خوای گەورەی تێدا بەرزبكرێتەوەو بپەرسترێ جگە لەو كەسیتر نەپەرسترێ.

ئەمەی پێشەوە پوختەی توێژینەوەكەمە لەسەر تیۆری قورئانی پیرۆز بۆ ئیسلام، داوا لە برایانی بەڕێزم دەكەم رێگام بدەن تا بە درێژی و بە وردەكارییەوە بچمە نێو ئەم هزرانەوە:

# مرۆڤ چاکترینی بەدیهێنراوەکانە

ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان روونیدەکەنەوە کە پەروەردگاری باڵادەست فریشتەکانی ئاگادار کردووەتەوە کە مرۆڤێك بەدی دەهێنێت: ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ البقرە: ٣٠. واتە: (ئەی محمد ﷺ کاتی خۆی پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی فەرموو: من بڕیارم داوە کە زەوی ئاوەدان بکەمەوەو کەسانێکی تێدا نیشتەجێ بکەم!!، کەچی ئەوان وتیان: باشە، ئەی خوای باڵادەست، تۆ زەوی بە کەسانێك ئاوەدان دەکەیتەوە کە فەسادو گەندەڵی تێدا بڵاو بکەنەوەو خوێنی بەناحەق تێدا بڕێژن، ـ لەکاتێکدا ئێمە شایستەین ـ ئێمە بەردەوام سەرگەرمی تەسبیحات و ستایش و سوپاسگوزاریی تۆین، قەدرو رێزو قودسیەتی تۆ پێدەزانین، خوای گەورە لەوەڵامدا فەرمووی: لەڕاستیدا ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن ـ هەموویان وانابن و دیندارو خواناسیان تێدا هەڵدەکەوێت لە هەموو زەمان و زەمینێکدا ـ .

لەبارەی سروشتی مرۆڤیشەوە خوای گەورە لە چەندین ئایەتی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ ﴾ **الأحزاب: ٧٢.** واتە: (لەڕاستیدا

ئێمە ویستمان ئەمانەتی دینداریو خواناسی بدەین بەسەر ئاسمانەکان و زەویو کێوەکاندا، کەچی هەموویان پاڕانەوەو داوایانکرد کە حەزدەکەین بەمشێوەیە بین، ترسان لە سەرپشکییو ئازادی، بەڵام ئینسان، ئادەمیزاد، قبوڵیکردوو هەڵیگرت...).

ئەو ئەمانەتەی کە ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان نەیانتووانی بچنەژێر هەڵگرتنی بریتیە لە پڕەنسیپی پارێزکاریی، ـ هەڵگرتنی ئەمانەت و پیادەکردنی پارێزکاریی ویستی ئازادانەی مرۆڤی دەوێ ـ چونکە ویستی خوای گەورە بە زۆرەملێو بە تۆپزی لە ئاسمانەکان و زەویدا جێبەجێ دەکرێ، هەمووی بەدیهێنراوەکان و فریشتەکانیش لەنێویاندا بەشێوەی زۆرەملێ گوێڕایەڵ و ملکەچی ویستی خوایین، گوێڕایەڵیی بەدیهێنراوەکانیش بەشێکە لە یاساکانی سروشت و لە ویستی زۆرەملێی خوایی لە دروستکراودا کە بە هیچ جۆر ناتوانرێ لێی دەرچێت. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿...وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴾ الفتح: ٢٣. واتە: (...هەرگیز گۆڕان بەسەر بەرنامەو بڕیارو یاسای خوای گەورەدا نایەت).

جگە لەوە ئیتر ناتوانن شتێکیتر بکەن، پەروەردگاریش ئەم گوێڕایەڵیەی کردووەتە یەکێك لە ڕێساکانی خۆی لە دروستکراوەکانیدا، بەڵام لەنێو هەموو بەدیهێنراوەکانیدا مرۆڤی ـ بە تەنها ـ بە ئازادانە دروستکردووە تا بە ویستی خۆی گوێڕایەڵی خوای گەورە بکات یان سەرپیچی بکات، مەرجی ئەم ویستە ئازادانەیە بریتیە لە پارێزکاریی،

پارێزکاریی دادەنرێ بە گەورەترین و مەزنترین بەهایەك کە خوای گەورە جەختی لەسەر دەکات، هەر لەبەرئەمە خوای گەورە مرۆڤی بە ئازادانە بەدیهێناوە تا بەویستی خۆی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکات، جا ئەگەرچی مەترسی گوێڕایەڵی نەکردن لە ئارادایە بەڵام ئەو ویستە ئازادانەیە هەر گێڕانەوەو رێگیریی کردنێکە بۆ مرۆڤ ، لەڕاستیشدا پارێزکاریی، واتە گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورە لە دیدگای پەروەردگارەوە هەر راگیرکارێکە بۆ مرۆڤ بە ئاستێکی وەها کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەڕوونی دەفەرموێ کە مرۆڤی بۆ دەستەبەرکردنی پارێزکاریی بەدیهێناوە: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ **الذاريات: ٥٦.** واتە: (لەڕاستیدا من ئادەمیزادو جنۆکەم تەنها بۆ پەرستنی خۆم دروستکردووە ـ ئەگەر ئەم دوو دەستەیە خواناس بن، هەموو چالاکییەکانی ژیانیان دەچێتە چوارچێوەی عیبادەت و خواپەرستییەوە ـ).

دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ... ﴾ **هود: ٧.** واتە: (ئەو پەروەردگارە زاتێکە کە ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش رۆژدا بەدیهێناوە، تەختی فەرمانڕەوایەتیشی ـ کە دروستکراوێکی زۆر گەورەو شکۆمەندەو زۆر گەورەترە لە ئاسمانەکان و زەوی ـ لەسەرئاو داناوە، تا ئەو خوای گەورەو باڵادەستە تاقیتان بکاتەوە لە جیهانی واقیعدا، کە کێتان پێشبڕکێ دەکات بۆئەوەی بەجوانترین شێوە کرداری جوان و

چاك ئەنجامبدات، سەیر لەوەدایە ئەگەر بەو خەڵكە بڵێیت: ئێوە دوای مردنتان زیندوو دەكرێنەوە، كافران ـ بێشەرمانە ـ دەڵێن: ئەم باسانە سیحرو جادووەو لە خەڵكی دەكرێت!!). وە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَیَوٰةَ لِیَبْلُوَكُمْ أَیُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًاۚ وَهُوَ ٱلْعَزِیزُ ٱلْغَفُورُ ﴾ **الملك: ٢**. واتە: (هەر ئەو زاتە خۆی مردن و ژیانی دروستكردووە، لەناوچوون و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بكاتەوەو دەربكەوێت كێتان كردەوەی چاكترو پەسەندترە، نەك تەنها چاك و پەسەندە، ـ دیارە خوای گەورە دەیەوێت بەندەكانی پێشبڕكێ بكەن لە چاكەخوازیدا ـ، دڵنیاش بن كە هەر خوای گەورە خۆی باڵادەستە ـ بەسەر یاخی و ستەمكارو بێباوەڕاندا ـ، لە هەمانكاتدا تەواو لێخۆشبووە لە باوەڕداران).

بە دڵنیاییەوە ئەو ئازادییە یان توانابوونی خۆڕازاندنەوە بە پارێزكارییەوەو جێبەجێكردنی بەها رەوشتیەكان، مەزنترین سیفەتە كە خوای گەورە بەخشیویەتی بە مرۆڤ، جا بۆئەوەی مرۆڤ لەتوانایدا بێت سودمەند بێت لێیو كاری پێبكات، ئەوا خوای گەورە هەست و هەستەوەرەكان و دڵ و توانای دەركپێكردن و دادوەرییو قەرەبووكردنەوەی لە دەستچووی پێبەخشیوە تا بە ئامانجی گەیشتن بە مەعریفە سود لەو توانایانە وەربگرێ.

﴿ ... إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ **الإسراء: ٣٦**. واتە: (...چونكە لەڕاستیدا دەزگاكانی بیستن و بینین و تێگەیشتن تۆ بەرپرسیاریت لەبەرانبەر هەرهەموویانەوە).

خوای گەورە زوبان و زاری بە مرۆڤ بەخشیوە تا لەڕێگایانەوە بتوانێ پرۆسەی لێکحاڵیبوون لەگەڵ کەسانیتردا ئەنجامبدات و سود لە ئەزموونیان وەربگرێ: ﴿ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴾ **البلد: ٩**. واتە: (هەروەها مەگەر زوبان و دوولێویشمان پێنەبەخشیوە؟ ـ زوبان و لێوەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە ئاخاوتندا، جگە لەوەی زوبان چەندەها بەشەو هەر بەشەی بۆ تامێك، هەروەها ڕۆڵێکی سەرەکیشی هەیە لە تێکەڵکردنی خۆراکداو لە ئاودیو کردنی ـ ).

مرۆڤیش وەك بەدیهێنراوێکی تەواوو کامڵ بەدیهێنراوە، واتە خوای گەورە بەجۆرێ دروستیکردووە کە توانای لەسەر کارکردن هەیە، پارچەکانی جەستەشی گونجاوو هەماهەنگن لەنێوان خۆیاندا: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾ **التين: ٤**. واتە: (سوێند بە هەموو ئەوانە ئێمە ئادەمیزادمان لە جوانترین شێوەو ڕێکوپێکترین شێوازدا دروستکردووە لە هەموو ڕوویەکەوە ـ ئەندامانی لەشی هەریەکە لەجێ‌و لەباری خۆیدایەتی، چ ئەوانەی دیارو دیوی دەرەوەن، چ ئەندامانی نادیارو ناوەوەی جەستە، هەروەها ئەو ڕۆحە تایبەتەی کە پێمان بەخشیوەو بەهۆیەوە ئەندامەکان هەموویان لەکاردان، ئەو نەفسەش کە ئامادەیی چاکەو خراپەی تێدا دابینکراوە...هتد ـ ).

﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴾ **السجدە: ٧**. واتە: (ئەو زاتەی کە هەموو شتێکی بە جوانی‌و چاکی‌و تێرو تەواوی

دروستکردووەو سەرەتای دروستکردنی مرۆڤیشی لە خاك دەستپێکردووە). ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ **غافر: ٦٤**. واتە: (**هەروەها بیربکەنەوە**، ئەوە هەر خوایە کە زەوی بەشێوەیەك بەدیهێناوە کە ئێوە لەسەری بسرەون، - هەرچەندە بەخێرایی هەزار کلم لە سەعاتێکدا دەسورێتەوە تا شەوو رۆژ پێش بێ، وە بەخێرایی ٦٣ هەزار کلم لە سەعاتێکدا بە دەوری خۆردا دەسورێتەوە تا ٤ وەرزە پێش بێت، جگە لە جوڵەکانیتری لەگەڵ کۆمەڵەی خۆرو کاکێشان و...هتد - کە چەند ئاسودەو ئارامن. هەروەها ئاسمانیشی بەڕاسەرتانەوە دروستکردووە - کە ملیۆنەها کاکێشان و ملیارەها ئەستێرەو هەسارەن و هەموویشیان لە چەرخ و خولدان - ، نەخش و نیگاری روخساری ئێوەشی بەجوانترین شێوە کێشاوە، - هەر شێوازێکیترو جێگۆڕکێ بە ئەندامەکان، روخسارمان دەشێوێنێو ترسناکی دەکات - ، هەروەها لە رزق و رۆزی چاك و جوان و بەتام بەهرەمەندی کردوون، ئائەوەیە پەروەردگاری ئێوە، بەڕاستی بەرزو پیرۆزو موبارەکە ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانە).

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ **التغابن: ٣**. واتە: (بێگومان ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەی حەق و راستی دروستکردووە، وێنەو نەخشی روخساری

یەکەیەکەتانی بەجوانترین شێوە کێشاوە، بەرێکوپێکترین شێواز، سەرئەنجامیش گەڕانەوەتان هەر بۆلای ئەو زاتەیە).

خوای باڵادەست خۆرو مانگی بەدیهێناوە، دەفەرموێ: ﴿...وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ...﴾ **الرعد**: ٢. واتە: (...**هەروەها** خۆرو مانگیشی ـ بۆ سودی ئینسان ـ رامهێناوە...).

وە رووبارو دەریاکانی دروستکردووە، دەفەرموێ: ﴿... وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴾ **إبراهیم**: ٣٢. واتە: (...**هەروەها** کەشتیشی رامهێناوە تا بە دەریادا بە فەرمان و ویستی خوا هاتووچۆ بکات، **هەروەها** جۆگەو رووبارەکانیشی بۆ ئێوە رامهێناوە ـ سودی زۆری لێوەردەگرن ـ).

شەوو رۆژیشی هێناوەتە بوون، دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتٌ ...﴾ **النحل**: ١٢. واتە: (**هەروەها** شەوو رۆژی بۆ رامهێناون، خۆرو مانگی بۆ دابینکردوون، ئەستێرەکانیش ـ کە لە ژمارە نایەن و قەبارەو دووری و پێکهاتەو خێرایی سوڕانەوەیان زانایانی ئەستێرەناسی سەرسامکردووە ـ بە فەرمانی ئەو زاتە لە خولگەکانیاندا لە چەرخ و خولدان ـ بە جۆرەها شێوەو خێرایی ـ ...).

ئەو پەروەردگارە سەراپای ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ملکەچی کردوون بۆ مرۆڤ، یان بە وردتر بڵێین تەواوی بەدیهێنراوەکان،

بۆئەوەی ئەم مرۆڤە بەویستی ئازادانەی خۆی بتوانێ سوودیان لێوەربگرێ، دەفەرموێ ﴿ أَلَمْ تَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ... ﴾ **لقمان:** ٢٠. واتە: (باشە، خەڵکینە ئێوە نابینن چۆن خوای گەورە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ خزمەتی ئێوەی رامهێناوە، وە لە نازو نیعمەتی هەمەجۆر بەهرەمەندی کردوون کە لە ژمارە نایەن، هەندێکیان دیارو ئاشکران و هەندێکیشیان نادیارن... ). ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ **الحج:** ٦٥. واتە: (باشە تۆ نابینیت چۆن خوای گەورە هەرچی لە سەرزەویو ناخی زەویدا هەیە - لە نەوت و گازو کانزا جۆراوجۆرەکان - بۆ ئێوەی رامهێناوەو لە خزمەتی ئێوەدایە، کەشتییە زەبەللاحەکانیش کە لە دەریادا دێن و دەچن هەر بە فەرمانی ئەو زاتە هاتووچۆ دەکەن و بەو یاسایانە بەسەر رووکاری دەریادا دەڕۆن کە خوای گەورە سازاندویەتیو رێکیخستووە، هەروەها هەر ئەو زاتە ئەستێرەو هەسارەکانی ئاسمانی راگرتووە تا نەکەونە سەرزەوی مەگەر بە ویست و بڕیاری خۆی، لەگەڵ لارو وێری زۆربەی خەڵکیدا هەر خوای گەورە بە نیسبەت سەرجەم خەڵکانەوە تەواو بەسۆزو میهرەبانە).

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ **الجاثية: ١٢.** واته: (خوای گەورە ئەو زاتەیە کە دەریای بۆ ئێوە رامهێناوە تا کەشتیەکان بە فەرمانی ئەو زاتە بە ناویدا هاتووچۆ بکەن و بەو یاسایانەی کە ئەو دایڕشتووە، هەروەها بۆ ئەوەش کە لە فەزڵ و نازو نیعمەتەکانی بەهرەمەند بن و سوپاسگوزاری خوا بن ـ بەردەوام قەدری نازو نیعمەتەکانی بزانن تا زۆرترو زیاترتان پێببەخشێت و لەو جیهانیش بە بەهەشتی بەرین شادتان بکات ـ ).

بە تەنیشت هەموو ئەمانەوە، خوای گەورە بەشێوەیەکی راستەوخۆ راستیی فێری مرۆڤ کردووە، دڵنیاییشی پێداوە کە راستیی شتێکی هەبووەو لەبارە بۆ تێگەیشتن لێی، هەر شتێکیش ریشك و پێناسەیەك (ماهیة)و سروشتێکی بەخۆی هەیە، هەروەها دڵنیایی بە مرۆڤ داوە کە لەتوانایدایە پەی ببات بە ماهییەتی ئەو شتانە، لەبەرئەمە خوای پاکوبێگەرد ناوی هەموو بەدیهێنراوەکانی خستوەتە سەر زوبانی مرۆڤ، یان بە دەستەواژەیەکیتر بڵێین ماهییەت و سروشتی هەموو بەدیهێنراوەکانی فێری مرۆڤ کردووە، دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ **البقرة: ٣١.**

واتە: ( ـ ئینجا باوکە ئادەمی دروستکردوو بەمەش ویستی توانایی‌و لێهاتوویی دەربخات بۆ فریشتەکان ـ ، بۆیە فێری ناوی هەموو شتەکانی

دەوروبەری کرد، پاشان هەموو ئەو شتانەی نیشانی فریشتەکانداو پێی فەرموون، ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ئەگەر راست دەکەن ـ خۆتان بە شایستەتر دەزانن ـ ).

مرۆڤ دادەنرێ بە بەدیهێنراوێکی نموونەیی‌و کامڵ، خاوەنی ویستی ئازادانەی خۆیەتی، لە توانایدایە زانست و دانایی فێرببێ، بەڕوونی دیارە کە کەسایەتی مرۆڤ کۆتا ئامانجی بەدیهێنانی بونەوەرە، جا بۆئەوەی ئەم بەدیهێنراوە کامڵ ببێ دەبێ بپەڕێتەوە بەسەر پردی پارێزکاریدا.

ئەوەش سەلمێنراوە کە مرۆڤ ئەو بەدیهێنراوە جوان و قەشەنگەی خوای گەورەیە کە هەموو ئەم بەهرانەی رادەستکردووە، باشترو چاکترە لە فریشتە، چونکە دەتوانێ کەسێکی خواناس و پارێزکار بێت، واتە وێڕای بوونی ویست و ئیرادەی ئازادانە تیایدا لەتوانایدایە گوێڕایەڵی خوای گەورە بکات، ئەمە ئەو هۆکارە بوو کە خوای گەورە ئەم بەدیهێنراوە جوانەی خستە پێشچاوی فریشتەکان و داوایلێکردن ئەگەر دەتوانن با لە بواری مەعریفەدا کێبڕکێی مرۆڤ بکەن، دەفەرموێ:
﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ، قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ، قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ، وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ **البقرة: ٣١ ـ ٣٤.**

واته: ( ـ ئینجا باوکە ئادەمی دروستکردوو ویستی توانایی و لێهاتوویی دەربخات بۆ فریشتەکان ـ بۆیە فێری ناوی هەموو شتەکانی دەوروبەری کرد، پاشان هەموو ئەو شتانەی نیشانی فریشتەکان داو پێی فەرموون، ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ئەگەر راست دەکەن ـ خۆتان بە شایستەتر دەزانن ـ ، کەچی هەموو وتیان: پاکیو بێگەردیو ستایش هەر شایستەی تۆیە، ئێمە ئەم شتانە ناناسین و ناویشیان نازانین، جگە لەو شتانەی کە خۆت فێرت کردووین، بەڕاستی هەر تۆی زاتی شکۆمەندو تەواو زاناو دانایت، ئینجا خوای گەورە فەرمووی بە ئادەم: ئادەی ئادەم تۆ ناوی ئەو شتانەیان پێبڵێ، کاتێ کە بەڕەوانی پێی وتن، خوای گەورە فەرمووی: مەگەر من پێم نەوتن، کە من شارەزاو ئاگادارم بە هەموو نهێنیەکانی ئاسمانەکان و زەوی ، هەروەها چاکیش دەزانم کەچی دەردەخەن و بە ئاشکرا دەیکەن، وە چیش دەشارنەوەو پەنهانی دەکەن لە دڵ و دەروون و ناختاندا، پاشان باسی ئەوەش بکە کە ئێمە فەرمانماندا بە سەرجەم فریشتەکان کە سوژدە ببەن بۆ ئادەم ـ سوژدەی رێز وە بە فەرمانی من ـ ئەوانیش هەموو فەرمانبەردار بوون و سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە سوژدەی نەبردو فیزی نواندو خۆی بەگەورە زانی، وە خۆی خستەڕیزی کافرو خوا نەناسانەوە ).

ئینجا لەدوای ئەوە بەچاوی خۆیان مەعریفەی سەرکەوتووانەی ئادەمیان بینیو ئەبڵەق بوون، ئەوکات خوای گەورە فەرمانی بە فریشتەکان کرد سوژدە ببەن بۆ ئادەم، ئەوانیش سوژدەیان برد بۆ مرۆڤ، ئیقراریان بەوەکرد کە مرۆڤ باشترو چاکترە لەخۆیان.

لێرەشدا دووجۆر مەترسی هەیە کە هەڕەشە لە ئازادی ئارەزوومەندانەی مرۆڤ دەکەن: یەکەمیان: یاخیبوون و گوێڕایەڵی نەکردن، دوووەمیان: هەڵەکردن، یەکەمیان: مانای ئەوەیە کە مرۆڤ بە ویستی خۆی لە توانایدایە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە بێت وە یان هەر بەو ویستەی خۆی دەتوانێ سەرپێچی بکات، دەکرێ کرۆکی مەعنەوی مرۆڤ بەهۆی چەند کاراکتەرێکەوە بجوڵێ، وەك خۆبەزلزانین و لەخۆباییبوون و نیەت خراپی یان پیسی دەروون و ناوەوەی مرۆڤ. مەترسی دووەمیش: بەو واتایەیە کە دەکرێ هەڵەی مرۆڤ لەبەرئەنجامی راست پەینەبردنی بێت بە بەها رەوشتیەکان یان بە پێوەری پارێزکاریی وە یان بەهۆی ڕای هەڵەوە لە ریزبەندکردنی بەهاکان و پلەکانیان، یان بەهۆی ڕای هەڵەوە بێت لەبارەی راستیو گونجاویی هۆکاری هەڵبژێردراو بۆ بەدەستهێنانی بەهای بە ئامانج گیراو.

لەڕاستیدا ئادەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) یەکەمین مرۆڤە کە هەڵەی ئەنجامدا: ﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ... ﴾ **البقرة: ٣٦.** واتە: ( ـ شەیتان ئەوەی بە هەل زانی هەرچی فێڵ و تەڵەکەو هەوڵی هەیە خستیەگەڕ ـ تا تووشی نافەرمانی کردن و هەڵیخلیسکاندن و لە بەهەشت بەدەرکردنیدان،...).

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ **البقرة: ٣٤.** ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟

﴿ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴾ طه: ١١٦. واته: (كاتى خۆی ئێمه فەرمانماندا بە فریشتەکان و وتمان: ئادەی سوژدە ببەن بۆ ئادەم ـ سوژدەی ڕێز وە بە فەرمانی من ـ ئەوانیش خێرا فەرمانیان بەجێهێناو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە یاخی بوو، فەرمانبەردار نەبوو).

هەر ئەو خۆبەزلزانینە بوو ریگیریی لە ئیبلیس ـ لە جنۆکەکان بوو ـ کرد ئیقرار بە سەرکەوتوویی مرۆڤ بکات و سوژدەی بۆ ببات، لێرەوە هات خایلەو وەسوەسەی خستە دەروونی ئادەم تا لە بەری درەختە حەرامکراوەکە بخوات، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٍ لَّا يَبۡلَىٰ ﴾ طه: ١٢٠. واتە: (شەیتان کەوتە فڕێدانی وەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ بۆ ئادەم و پێیوت: ئایا حەزدەکەیت درەختی نەمریت نیشان بدەم ـ کە ئەگەر لە بەروبومەکەی بخۆیت ـ ئەوە دەستەڵاتت بەردەوام دەبێت و موڵك و دەستەڵاتێکت دەبێت کە هەرگیز لەناو ناچێت!!).

ئادەمیش (سەلامی خوای لەسەر بێت) هەڵخەڵەتا، بەڵام زۆر زۆر خێرا هەستی بە هەڵەکەی کرد، پەنجەی پەشیمانی گەست و تەوبەی کرد، خوای گەورەش تەوبەکەیی پەسەند کرد: ﴿ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴾ طه: ١٢٢. واتە: (پاشان خوای گەورە بەزەیی پیایدا هاتەوەو هەڵیبژاردو ـ کردی بە پێغەمبەر ـ تەوبەشی لێوەرگرت و

هیدایەت و ڕێنمایی کرد ـ بۆ ڕێبازی دینداریو خواناسیو گەڕانەوە بۆ بەهەشت ـ ).

خوای گەورە بە سۆزو بەخشندەیی و بەزەیی خۆی، وە بۆ ئەوەی مرۆڤەکانیتر نەکەونە هەڵەوە، تواناییو ئیرادەی خۆی پیشانی ئادەم داو حوکمەکانی پارێزکاریی فێرکرد، دەفەرموێ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ البقرة: ٣٧. واتە: ( ـ جا خوای گەورە ئەوەندە بە لوتفە لەگەڵ ئادەم و نەوەکانیدا ـ هەر خۆی فێری چەند دوعاو نزایەکی کرد ـ کە لە ئایەتی ٢٣ی سورەتی الاعراف دا هاتووە ـ کاتێ کە بە دڵ و بە کوڵ دانی بەهەڵەی خۆیدا نا، ئەو زاتەش تەوبەو پەشیمانیەکەی لێوەرگرت، چونکە ئەو زاتە بەڕاستی تەوبە وەرگرە لە ئیماندارانی پەشیمان، تەواویش میهرەبانە پێیان).

بەڵێنیشی دا کە ڕێنمایی مرۆڤ بکات بەرەو ئاڕاستەی ڕاست و دروست، وە لەڕێگای وەحییەوە حوکمەکانی ئەو پارێزکارییە روونبکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ البقرة: ٣٨. واتە: (ئینجا جارێکیتر دووپاتمان کردەوەو وتمان: تازە ئیتر دەبێ هەرهەمووتان دابەزن ـ ئادەم و حەوواو شەیتان ـ جا هەرکات بەرنامەی ڕێنمایی لەلایەن منەوە هات بۆتان، دڵنیابن کە ئەوەی ڕێبازی هیدایەت و بەرنامەو پەرستنی من بگرێتەبەر ئەوا ئەوکەسانە نە ترس و بیم لە

سەرەمەرگ و قیامەتدا یەخەیان دەگرێت، وە نە تووشی هیچ جۆرە خەم و پەژارەو دڵەڕاوکێو ناسۆرێك دەبن).

خوای گەورە (لە هەمان ئایەت)دا بەڵێنی بەوکەسانە داوە کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن هیچ ترسێکیان لەسەر نیەو نابێ ئەوانیش غەمبار ببن.

وە لە هەردوو ئایەتی (١٣٣و١٣٤)ی سورەتی (طه)دا روونی کردووەتەوە کە هۆکاری سەرشۆڕی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ شوێننەکەوتنی پێغەمبەران: دەفەرموێ ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ، وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴾ طه: ١٣٣ ـ ١٣٤. واتە: (موشریکەکان بیانوو دەگرن و دەڵێن: باشە، ئەوە بۆ محمد ﷺ لەلایەن پەروەردگارییەوە موعجیزەیەکی بۆ نەهێناوین ـ تا باوەڕی پێبکەین! ! ـ ، باشە باسی ئەو موعجیزانە لەلاپەڕەی سورەتە پێشوەکان و لە کتێبە پێشوەکانماندا روونکراوەتەوە ـ کە نەبوونەتە هۆی باوەڕهێنانی خەڵکی، ئەمانیش هەڵوێستیان هەروا دەبێت ـ.

ـ ئەوانە بۆ بڕوا ناهێنن، بۆ سوپاسی خوا ناکەن ـ ، خۆئەگەر پێش هاتنی ئەو پەیامە بە سزایەك لەناومان ببردنایە ئەوە لەو کات و ساتانەدا دەیانوت: ئەی پەروەردگار ئەوە بۆچی تۆ پێغەمبەرێکت بۆ رەوانە نەکردین، تا شوێنی بەرنامەو ئایەتەکانی تۆ بکەوین،

فەرمانەکانی تۆ ئەنجامبدەین پێش ئەوەی زەلیل و خەجاڵەت و ریسوا ببین!!).

ئەوی راستی بێت جێبەجێنەکردنی ئادەم بۆ فەرمانی خوا نەبووە هۆکارێ بۆ خراپبوونی خوو و سروشتی، وە ئەم هەڵەیەش بە ڕێگای بۆماوە (الوراثة) نەگوێزرایەوە بۆ نەوەکانی، راستیش نیە ئەگەر بۆچوونمان وابێت کە مرۆڤ هەر لەڕۆژی لەدایکبوونیەوە ئیتر بە هەڵەکار دادەنرێ چونکە ئادەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) هەڵەی کردووە. هەڵەکەی ئادەم تەرخان و سنورداره بە شوێن و کاتێکی دیاریکراوەوەو پەلناکێشێ بۆ سەراپای شوێن و کاتەکان و ناچەسپێ بەسەریاندا، هەمووی مرۆڤایەتی تێنەگلاوە پێیەوە، لەبەرئەوە ئەم بۆچوونە، واتە: مرۆڤایەتی ئەوەی بۆ تەقدیرکراوە کە هەردەبێ بەهۆی ئەو هەڵەیەی ئادەمەوە لە نەهامەتیو بەدبەختیدا بژی، بۆچوونێکی هەڵەیە. لەڕاستیدا جێبەجێنەکردنی فەرمانی خوا لەلایەن ئادەمەوە (سەلامی خوای لەسەر بێت) هەڵەیەکەو دەکەوێتە سەرشانی ئادەم و هەر زاتی خۆی بەرپرسە لێی، جگە لەوەش خوای گەورە هەر لێیشی خۆشبوو، بەمجۆرە دەڵێین ئەو هەڵەیەی ئادەم کارەسات و مەرگەساتێ نەبوو کە سەراپای مرۆڤایەتی بگرێتەوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو هەڵەیە کەشوهەوایەکی لەباری رەخساند کە ئەنجامەکەی بەوە بوو خوای گەورە کۆمەڵێ یاسای رەوشتی یان پارێزکاریی لەڕێگای وەحییەوە بخاتە بەردەم ئادەم و ئەوانەش لەدوای ئەو هاتن تا بتوانن لەڕێگای ئەو یاسایانەوە رێنماییەکانی خوای گەورە جێبەجێ بکەن.

# چەمکی ئەمانەتی خوایی

ئامانج لە دروستبوونی مرۆڤ هەرگیز ئامانجێکی نەرێنی نەبووە، ئەوەتا خوای گەورە راشکاوانە دەفەرموێ: ﴿...يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ ...﴾ البقرة: ١٨٥. واتە: (...لەڕاستیدا خوای گەورە کارئاسانی بۆ ئێوە دەکات...).

مەعلومە کە چەمکی وشەی (اليسر) بەئاسانی تێگەیشتنی لێدەکرێ، چونکە پێچەوانەی تەنگانەیی و سەختیەو بێبەشبوون و نەبوونی حەوانەوەیە، هەروەها دژی هەر فشارو دڵەڕاوکێ و هاوشێوەکانیانە.

ئیسلام ئایینێکە ژیان و جیهان بە ئەرێنی دادەنێ، ئامانجی بونیاتنانی مرۆڤە، خوای گەورەش چەندەها حەزو ویستی خۆڕسك و ئارەزوو و سۆزی لە ناخی ئێمەدا داناوە، داوای لێنەکردووین هەستین بە خەفەکردن و کپکردن و دامرکاندنەوەی ئەو ئارەزووانە، بەڵکو داوامان لێدەکات ئەو حەزو ئارەزوو و سۆزو ویستە خۆڕسکانە بە شێوەیەکی راست و دروست بەکار بهێنین تا یارمەتیمان بدەن لە کاروانی بونیاتنانی خۆماندا، هەموو ئەم بەهانەش سودمەندن، بە ڕاستی بڵێین کە رازیکردنی ئەو حەزو غەریزەو ئارەزوو و سۆزانە بەتەنها ئەوە نیە کە کارێکی رەوا بێت بەڵکو واجبیشە، چونکە ئەو بەهرانە بەشێکن لەو

نیعمەتانە کە خوای گەورە بەخشیوینی بە مرۆڤ، دادەنرێن بە ڕێساو یاسا گەردوونیەکان، قورئانی پیرۆزیش راشکاوانە ژیانی رەبەنی رەتدەکاتەوەو دژی دامرکاندن و خەفەکردن و کۆتکردنی ئەم بەهرانەیە. دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ **الحديد: ٢٧.**

واتە: (لەوەو دوا بە شوێن ئەو پێغەمبەرانەدا پێغەمبەرانی ترمان رەوانەکرد ـ کۆتایی زنجیرەی ئیسحاقمان هێنا ـ عیسای کوڕی مەریەم مان رەوانەکرد. ئینجیلیشمان پێبەخشی، سۆزو میهرەبانیمان خستەنێو دڵی ئەوانەوە کە شوێنی کەوتبوون، کەچی ئەوان رەهبانیەت و گۆشەگیریان کردە پیشەیان، لە حاڵێکدا ئێمە ئەوەمان لەسەر فەرز نەکردبوون بەڵکو بەدەستهێنانی رەزامەندی خوامان لێ داوا کردبوون، کەچی ئەوان ئەو رەهبانیەت و گۆشەگیریەیان بە چاکی پەیڕەو نەکرد، ئێمەش پاداشتی ئەوانەمان دایەوە کە باوەڕی راست و دروستیان هەبوو، ئەوانەش کە زۆرینەیەکی لارو وێرو خوانەناس و یاخی دەرچوون ـ سزادەدرێن ـ).

کەواتە هەر رازیکردنێکی راست و رەوا بۆ حەزو غەریزەکان کارێکە دژ نیە لەگەڵ پارێزکاریدا، بەهەمانشێوە یارمەتیدانی کەسانیتریش لەسەر رازیکردنی غەریزەو خواستەکانیان کارێکی پێویست و واجبە،

بەڵكو لەڕاستیدا بەشێكە لە گوێڕایەڵیكردن و پەرستشەكان هەروەك چۆن ئەركی سەرشانی بەرپرسی خێزانە كە دەبێ كەشوهەوای خۆشی بڕەخسێنێ بۆ تاكەتاكەی خێزانەكەی، یان هەروەك چۆن دەبێ فەرمانڕەوا كاربكات لەپێناو باشكردنی بارودۆخی خەڵكی ، یان ئەركی برا بەرانبەر بە براكەی، ئەگەرنا ئەوا زۆربەی بەهاكان وەك رەوشت و پارێزكاریی دەبنە كۆمەڵە كارێكی هەڵەو درۆو دژ بەیەك، بەم پێیە ئەوا چەمكی پاككردنەوەی دەروون و برایەتی ئیسلامی مانای راستەقینەی خۆیان لە دەست دەدەن.

خوای گەورە ئێمەی خستوەتە سەر ئەم زەوییەو فەرمانی پێكردووین كە ئاوەدانی بكەینەوە بۆئەوەی لەسەری بژین و تا ئەوپەڕی سود لێوەرگرتن سودمەند بین لێی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴾ **هود: ٦١.**
واتە: (بۆ هۆزی (ثمود)یش (صالح)ی برایانمان رەوانەكرد ئەویش وتی: خزمینە هەر خوای گەورە بپەرستن، چونكە خوایەكی تری بە حەقتان نیە كە شایانی پەرستن بێت جگە لەو زاتە، هەر ئەویش بەرپای كردوون لەسەر زەویداو داوایلێكردوون كە هەوڵبدەن بۆ ئاوەدانكردنەوەی، كەواتە هەردەم داوای لێخۆشبوونی لێبكەن و پاشان بگەڕێنەوە بۆلای بە ئەنجامدانی فەرمانەكانی، دڵنیاش بن كە پەروەردگارم لێتانەوە نزیكەو دوعاو نزای بەجێتان گیرا دەكات).

هەروەها خوای گەورە   ئەم زەوییەی رازاندوەتەوە تا مرۆڤ لە بونیاتنانی خۆیدا سودی لێوەربگرێ. دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ **الكهف: ٧**. واتە: (دڵنیابە کە هەرچی لەسەر زەویدایە کردوومانە بەهۆی رازاندنەوەی ، تا بەکردەوە دەربکەوێت کە کێ تەنها بۆ دنیا دەژیو حیساب بۆ حەڵاڵ و حەرام ناکات، وە کێش چاکترین و جوانترین و پاکترین کاروکردەوە ئەنجامدەدات).

﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ **النحل: ٨**.

واتە: (ئەسپ و هێسترو گوێدرێژی بۆ رامهێناوین تا بۆ سواری سودی لێوەربگرین، جگە لەوەی کە زینەت بەخشیشە، لە ئایندەشدا شتی وا دروستدەکات کە ئێوە ئێستە نایزانن و پەی پێنابەن). ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴾ **الحجر: ١٦**. واتە: (لەڕاستیدا ئێمە لە ئاسماندا ئەستێرەو هەسارەی گەورەی بێشوماری زەبەللاحمان دروستکردووە ـ دووری هەندێکیان ملیارەها کیلۆمەترە، قەبارەی هەندێکیان ملیۆنەها ئەوەندەی زەوی بەڵکو خۆریشە ـ !! وە رازاندومانەتەوە بۆ تەماشاچیان ـ وەك سورەییا هەڵمانواسیون، لە شەوگاری تاریکیدا دیمەنیان دڵڕفێنە ـ ). ﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴾ **الصافات: ٦**. واتە: (بیگومان ئێمە ئاسمانی دنیامان

رازاندوەتەوە بە ئەستێرەو هەسارەی هەمەجۆر ـ لە قەبارەو دووریو نزیکیاندا ـ).

فەرمانیشمان پێدەکات سود وەربگرین لەو جوانیی و نیعمەتە: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾ الأعراف: ٣١. واتە: (ئەی نەوەکانی ئادەم، بە پۆشاکی جوان خۆتان برازێننەوە لەکاتی نوێژو لەهەموو مزگەوتێکدا، لە هەموو نازو نیعمەتەکانی خواردن و خواردنەوە بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، چونکە خوای گەورە زیادەڕەوان و لەسنور دەرچووانی خۆش ناوێت).

﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾ الأعراف: ٣٢.

واتە: (ئەی پێغەمبەرﷺ بەو خەڵکەی کە وادەزانن سود وەرگرتن و بەکارهێنانی ناز و نیعمەتە جوانەکان حەرامن، بڵێ: باشە ئەوە کێ جورئەتی داوە بەخۆیو ئەو زینەت و جوانیانەی خوای گەورە بەخشیوینی بە بەندەکانیو بۆی بەدیهێناون، بە حەرام لە قەڵەمیان دەدات؟ ئەوە کێیە رزق و رۆزییە چاکەکان لەخۆی و لەخەڵکی حەرام دەکات؟...بەو خەڵکە بڵێ: هەموو ئەو نازو نیعمەتانە لەژیانی دنیادا بۆ ئیماندارانیش حەڵاڵە، بەڵام لە قیامەتدا تایبەتە تەنها بۆ ئیمانداران، ئا بەوشێوەیە ئایەت و فەرمانەکان ڕووندەکەینەوە بۆ کەسانێك کە هۆشیاربن و لە ڕێنماییەکانی ئێمە تێبگەن).

قورئانی پیرۆز زەوییەکی قوبولّ نیەو ئیقرار بە زەوییەك ناکات کە ئاوەدان نەکرابێتەوەو وێرانە بیّ، یان بە زەویەك کە لەپاش ئاوەدانکردنەوەی پشتگویّ خرابێت: ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴾ **الحج: ٤٥.**

واتە: (لەڕاستیدا ئێمە خەڵکی زۆر شارو شارۆچکەو ناوچە جۆر بەجۆرەکانمان لەناوداوە کاتێك ڕێبازی شیرك و ستەمیان پەیڕەو کردووەو قەناعەتیان بە ڕێبازی یەکخواناسی نەهێناوە، جا دەبینی شوێنەواریان هەر بیرو سەرچاوەی بێخاوەن و کۆشك و تەلاری چۆلّ و هۆڵە). وە دەفەرمویّ: ﴿ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا ۖ وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا ۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴾ **الحشر: ٢.**

واتە: (ئەو پەروەردگارە زاتێکە کاتێك بێباوەڕانی خاوەن کتێب ـ لە جووەکان ـ کەوتنە نەخشەکێشان و پیلانگێڕان دژی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و سەرجەم هاوەڵان، خوای گەورە پشتیوانی لە پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران کردوو جووەکانی ـ بنونضیر ـ ی لەیەکەم دەستپێکردنی کۆکردنەوەدا لە شوێنی نیشتەجێبوونیان دەریکردن، هەرچەندە، ئێوە بەتەمانەبوون ئاوا بەئاسانی بڕۆن و چۆڵیبکەن، ئەوانیش وایاندەزانی قەڵاکانیان لە ویست و ئیرادەی خوای گەورە دەیانپارێزێت، کەچی لەشوێنێکەوە خوای گەورە بەڵای بەسەرهێنان کە بەخەیاڵیاندا

نەهاتبوو، حیسابیان بۆ نەکردبوو، ترس و بیمی فڕێدایە نێودڵیانەوە، ئیتر لەداخ و خەفەت و ناچاریدا خۆیان دەستیان کردە کاولکردنی خانووبەرەو ماڵەکانیان بەدەستی خۆیان و بەدەستی ئیمانداران، کەواتە ئەی خاوەن بیروهۆش و دووربینەکان دەرس و پەندو ئامۆژگاری وەربگرن - دیارە جووەکانی ئەمڕۆش کە ستەم لەگەڵ فەلەستین بەتایبەتیو مرۆڤایەتی بەگشتی دەکەن هەروا بۆیان ناچێتەسەرو، نەخشەی پەروەردگاری باڵادەست لەکاردایە بۆ ریشەکێشکردنیان ئەگەر ئیمانداران شایستە بن - ).

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ البقرة: ١١٤. واتە: (جا کێ لەوە تاوانبارترو ستەمکارترە کە قەدەغەی خەڵکی دەکات لەوەی کە ئەو مزگەوتانە قورئانی خواو ناوی خواو یادی خواو باسی ئایینی خوای تێدا بکرێت، وە هەوڵبدات بۆ وێرانکردنیان، ئائەوانە مافی ئەوەیان نیە بچنەنێو مزگەوتەکانەوە مەگەر ترسی خوا لەدڵیاندا بروێت و بەخۆیاندا بچنەوە...جا ئەوانەی کە بەردەوام دەبن لە دژایەتی مزگەوت و موسڵماناندا سەرشۆڕیو خەجاڵەتیو ریسوایی بەشیانە لەدنیاداو، لە دوارۆژیشدا سزایەکی گەورەو سامناك چاوەڕێیانە). ﴿ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ

بِرَبِّيٓ أَحَدًا ﴾ **الكهف: ٤٢. واتە: ( ـ دیارە کابرا بەو ئامۆژگاریەو بیرخستنەوانە دانەچڵەکیوەو لە لووتبەرزی خۆی نەکەوتووە ـ بۆیە خوای گەورە هەموو رەنجەکەی بەبادا، هەموو بەروبوومەکەی لەناودا، هیچی نەما ، ئەویش هیچی بۆنەمایەوە جگە لەوەی کە دەستەکانی دەدا بەیەکداو بە حەسرەتەوە دەیوت: ئای چەندە مەسرەفم تێداکرد، چەندە رەنجمداو پارەم تێیدا خەرجکرد، ئیتر باخەکە هەمووی وێران بوو بەسەریەکدا، بۆیە بە هەناسەی ساردەوە دەیوت: خۆزگە شەریك و هاوەڵم بۆ پەروەردگارم بڕیار نەدایە ! !).**

**یەکێ لەو سزایانەی کە خوای گەورە سەپاندویەتی بەسەر بێباوەڕان و یاخیان و سەرپێچیکاراندا بریتیە لە وێرانکردنی وڵات و شارەکانیان و شوێنی نیشتەنیان، کاولکردنی کشتوکاڵ و زەوی و باخ و بێستانیان، وەدەرنانیان لە خانووەکانیان و دواجار لەناوبردنیان: دەفەرموێ:**

﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ **البقرة: ٢٥٩.**

**واتە: (یاخود ئەوکەسەی بەلای شارۆچکەیەکدا گوزەری کرد لەکاتێکدا کە هەمووی وێران و کەلاوە بوو، سەری خانووەکانی تەپی بوون و دیوارەکانی بەسەریدا روخابوون ژیانی تێدا نەمابوو،**

لەبەرخۆیەوە وتی ئاخۆ خوای گەورە چۆن جارێکیتر ئەم شارۆچکەیە ئاوەدان بکاتەوە؟!، ـ زۆربەی تەفسیر نوسەکان دەڵێن ئەو کەسە عوزەیر پێغەمبەر بووە ـ ، ئەوسا خوای گەورە گیانی لێسەندەوەو ماوەی سەدساڵ مراندیەو پاشان زیندووی کردەوەو لێی پرسی: ئەوە تۆ چەندە لێرەدا ماویتەوە؟!عوزەیر وتی: رۆژێك یان کەمتر لە رۆژێك، خوای گەورە فەرمووی، نەخێر رۆژو شتی وانیە، بەڵکو تۆ سەدساڵت پێچووە، سەرنجی خواردن و خواردنەوەکەت بدە لەوماوە دوورو درێژەدا تێکنەچووەو نەگۆڕاوە، بەڵام تەماشای گوێدرێژەکەشت بکە، بۆیە ئەمەمان کرد تاتۆ ببیتە موعجیزە بۆ خەڵکی، جا سەیری ئێسکەکانی گوێدرێژەکەت بکە، چۆن بەیەکیانەوە دەلکێنین و پێکەوە دەیانبەستین و پاشان گۆشتیان دەکەین بەبەردا، کاتێك ئەو حاڵەتەی بینی بەتەواوی دڵنیابوو و وتی: جا ئێستە چاك دەزانم کە بەڕاستی خوای گەورە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ـ بە تێپەڕبوونی ئەو سەدەیە بەسەر عوزەیر پێغەمبەردا رواڵەتی نەگۆڕابوو، بەڵام کە گەڕایەوە بۆ شارۆچکەی خۆی، کوڕو کوڕەزا ساواکانی و منداڵە وردیلەکانی ئەو رۆژگارەی کە ئەم بەجێی هێشتبوون تەمەنیان لەسەرو سەدساڵەوە بوو، بە ناونیشان و گەڕانەوە بۆ مێژووی سەفەرەکەی و شایەتی تەمەنداران ئیتر گەنج و کوڕو کوڕەزای سەروڕیش سپی ناسیانەوە کە باپیرەیانە!! ـ). —پێشتریش واتای ئەم ئایەتە پیرۆزە

هاتووه كه دەفەرموێ ـ : ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴾ **الحج: ٤٥.**

وه دەفەرموێ :﴿ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوٓاْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ **النمل: ٥٢.** واته: (ئەوەبوو لە ساتەوەختێكی ناكاودا هەموو ماڵەكانیان چۆڵ و هۆڵ بوو، كەس نەما، هەمووان بەهۆی ستەمیانەوە لەناوچوون، لەڕاستیدا ئالەو بەسەرهاتەدا —كە ئاسەوارەكانی ماوە ـ بەڵگەو نیشانەیەكی ئاشكرا هەیە بۆ كەسانێك كە دەركی ڕووداوەكان دەكەن و لە ڕوانگەی زانستەوە لە شتەكان دەكۆڵنەوە). ﴿ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴾ **الحاقة: ٧.** واته: (ئەو ڕەشەبایە حەوت شەوو هەشت ڕۆژی تەواو هەڵیكردە سەریان ـ ئەگەر لەوێ بوویتایە ـ دەتبینی ئەو هەموو خەڵكە بێ دین و خوانەناسە لاڵ و پاڵ لێی دەكەون، هەروەكو دارخورمای وشك و لەڕەگ و ڕیشە دەرهێنراو چۆن بەئاسانی دەكەوێت و شەق دەبات ـ شایانی باسە خەڵكەكە هەمووی باڵابەرزو تێكسمڕاو بوون، بەهێزو بەتوانا بوون، بەڵام غەڕراو دوور لەخوا بوون، لاشەی هەندێكیان لە ڕۆژهەڵاتی نیوەدوورگەی عەرەب دۆزراوەتەوەو وێنەی گیراوە، كەسێكی ئەمڕۆ بەقەدەر باڵێكی ئەوان دەنوێنێت!). چاكەكاران و شوینكەوتووانی حەق و ڕاستی بەردەوام ئاواتەخوازن كە ئەمجۆرە سزاو كارەساتانەیان بەسەردا

نەیەت، خوای گەورە بەڵێن بە بەندەکانی دەدا کە ئەگەر ئەوان ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگارەکەیان بن ئەوا تووشی ئەم سزایان نابن، دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ **النور: ٥٥.**

واتە: (خوای گەورە بەڵێنی داوە بەو ئیماندارانەی کە کاروکردەوە چاکەکان ئەنجامدەدەن بەوەی کە پایەدارو دەستەڵاتداریان دەکات لەسەر زەویدا، هەروەکو ئیماندارانی پێش ئەمانی پایەدار کرد، هەروەها بەڵێنی داوە کە ئەو ئایینەش لەنێوانیاندا پایەدارو پیادە بکات کەلای پەسەندەو پێی رازییە، تا لە هەموو بوارێکدا پیادە بکرێت، ئینجا دوای ئەو هەموو ترس و بیمەی کە هەیان بوو دەیانخاتە هێمنی و ئاسایش و هێورییەوە، ئەوسا ئەوانیش هەر تەنها خوای گەورە دەپەرستن و بەدوور دەبن لە هەموو جۆرە شیرك و هاوەڵگەرییەك، جا کەسێ دوای ئەوە هەر باوەڕ نەهێنێت ئەوا هەر ئائەوانەن خۆیان کەسانێکی فاسق و گوناهکارو لەسنوور دەرچوون).

ئایینی ئیسلامیش تاکە ئایینە کە مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ بیناکاری و ئاوەدانکردنەوە، ئەم کارەش دادەنێ بە کارێکی خوازراوو چاك لە ژیانی دنیادا، ئەم بیرۆکەیە روون و ئاشکرایە لە ئیسلامدا، بە دڵنیایی ئیسلام ئەو ئایینەیە کە شوێنکەوتووانی هەڵدەنێ بۆ بردنەسەری ژیانێکی

زۆرباش و ئاوەدانکردنەوەی زەوی، مێژووی گەلانی ئیسلامی ئەم ڕاستیەیان سەلماندووە، موسڵمانانیش لە ئاوەدانکردنەوەی شارەکاندا بە لێهاتوویی‌و حەزو شەوق و زەوق ناوبانگیان دەرکردووە، بەهەمانشێوەش لە باخدارییو کشتوکاڵ و پیشەسازییو بەرزکردنەوەی ئاستی تەندروستی خەڵك و ڕۆشنبیریی ناوبانگیان هەبووە، هەروەها بەناوبانگ بوون لە بڵاوکردنەوەی زانستدا، بە تەنیشت هەموو ئەمانەشەوە موسڵمانان لە دروستکردن و ڕازاندنەوەی قاپ و قاچاخ و فەخفوری و فەرش و ماڵەکاندا سەرکەوتووتر بوون بەسەر غەیری خۆیاندا.

## ئیسلام ئایینێکی جیهانییە

ئەگەر دامەزرێنەری هەر ڕێچکەو ڕێبازێك هەستێ تەنها بە بەرگریکردن لە توێژێکی تایبەت و بایەخ نەدات بە توێژەکانیتر، ئەوا ئەو ڕێبازە تەنانەت ئەگەر باشترینی ڕێچکەو ڕێبازەکانیش بێت هەر شتێکی نەخوازراوو ناباشەو ڕەتدەکرێتەوە، لەڕاستیدا پراکتیزەکردنی تیۆرێکی مرۆیی کە تایبەت بکرێ بە کۆمەڵێکی دیاریکراو لە خەڵکی، خۆی لە خۆیدا هۆکارێکە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو تیۆرەو کەمبوونەوەی پێگەو پایەکەی، سەرئەنجام دەبێتە تیۆرێکی نەشیاوو نەگونجاو بۆ مرۆڤ، هیچ شتێکیش لەوە زیانمەندتر نیە بۆ مرۆڤ کە کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان ببنە خاوەنی چەندین تایبەتمەندیی باش و جیاکار هاوکات خەڵك و کۆمەڵەکانیتر بێبەش بکرێن لێیان.

ئەم جیاوازی خستنە دەبێتە هۆکار بۆ هەڵگیرسانی شەڕو وێرانکارییو دەربەدەرییو دوژمنایەتی لەنێوان خەڵکیدا، ئەمەش دەمارگیریی نەفامییە کە ئیسلام هەر لەوساتەوە کە لە مەککە دەرکەوت بە هەموو توانای دژی وەستایەوە، چونکە خوای گەورە هەرجۆرە دەمارگیرییەکی نەفامی قوبوڵ ناکات و بە توندی رەتیدەکاتەوە.

دەمارگیریی نەفامی خۆی لە چەندین جۆرو شێوەی جیاجیادا دەخاتەڕوو، لەوانە: دەمارگیریی نەژادیی، دەمارگیریی نیشتمانی، دەمارگیریی نەتەوەیی، دەمارگیریی تایفەگەرییو...تادوایی، جائەگەر لێکۆڵینەوەو توێژینەوە بۆ ئەم دیاردەیە بکرێ ئەوا بۆمان روونده‌بێتەوە کە ریشکی ئەم هەڵەیە لەناسینی سروشتی شتەکاندا خۆی دەبینێتەوە، واتە کاروبارە مادديەکان لەم هاوکێشەیەدا جێگای کاروبارە مەعنەویەکانیان گرتووەتەوە.

دەمارگیریی نەفامی لەدیدو بۆچوونی تاکێکی نەفامەوە پەیدا دەبێت کە وادەبینێ ماددە وێنای راستەقینەی مەعنەویەت دەکات، هەڵگرانی ئەمجۆرە دیدو هزرانە خۆیان هەڵدەواسن بە سروشتی جوگرافیو زمان و شێوەو رواڵەتی مرۆڤ و باری کۆمەڵایەتی و ماددییەوەو ئەم پێوەرانە دەکەنە بەڵگەی دەستیان بۆ خۆ بەزلگرتن و پۆزلێدان بەسەر ئەو مرۆڤانەی تردا کە ئەمجۆرە تایبەتمەندیو نیشانە جیاکارانەیان تێدانیە، بە پێی بۆچوونی ئەوانە ئەوا دەکرێ هەریەك لەو تایبەتمەندیو نیشانانە بکرێتە پێوەرێك بۆ فەزڵدان و باشتر زانینی کەسێك بەسەر کەسێکیتردا، کەسی نەفام و دەمارگیر هەموو کارە مەعنەویەکان و بەرزیی رەوشت

(بۆ مرۆڤ) لەسەر بنەمای تایبەتمەندییە ماددییە ڕواڵەتیەکان دەپێوێ، لەهەمان کاتیشدا ئەوکەسانەی کە بێبەشن لەو تایبەتمەندییە ماددییە جیاکارو ڕواڵەتیانە وا دادەنێ کە لەڕووی ڕەوشتییەوە کەسانێکی خراپن و خاوەنی پێگەو پلەی نزم و داڕوخاون.

مەعلومە هەرتاکێك پەنا ببات بۆ دەمارگیریی کوێرانە، وای لێدەکات چاوبپۆشێ لەکارە مەعنەوی و ڕەوشتیەکان، بەڵکو وای لێدێ کە کارە مەعنەویو ڕەوشتیەکان بەوە دابنێ کە کۆمەڵە ئامڕازێکن و بەهاکانیان بەپێی پێوەرە ماددیو ڕواڵەتیەکان دیاری دەکرێ وەك ڕەنگی پێست و ڕەگەزو پێگەی کۆمەڵایەتی و بڕی ماڵ و سامان و شتانیتری لەو شێوەیە.

زیاد لەمانەش ئەوا هەر پێناسەیەکیان بۆ کۆمەڵەو گروپ یان ڕەگەز بەدەگمەن ڕاست و ورد بێت، بە ئاستێکی وەها هەر بۆ ڕازیکردنی ئارەزوو و حەزە تایبەتەکانیان پێشێلی ئەو یاسایانە دەکەن کە خۆیان واژوویان لەسەر کردوون و دەیاندەن بەدیواردا، باشترین نموونەش لەسەرئەمە ئەو جیاوازی ڕەگەزیەیە کە لەخوارووی ئەفەریقیا ڕوودەدات و یابانیەکان لە ڕەگەزی سپی ناوزەد دەکەن، بەڵام تاکی میسری یان سوری لە ڕەگەزی ڕەش ناوزەد دەکەن، یان ئەوەی کە لەماوەی دەستەڵاتی نازی دا ڕوویدا کە هەموو ئەوروپیەکانیان جگە لە جولەکە لەنێو ڕەگەزی سپی دا هەژمار کرد.

گومانی تێدانیە دەمارگیریی نەفامی کە لەسەر بناغەی مێژوویی‌و جوگرافی‌و بایۆلۆژی یان لەسەر بنەمای فیزیۆلۆجی بەرپا دەبێت

چەمکێکی هەڵەیە. لەبەرانبەر ئەم دەمارگیریەوە دەبینین کە قورئانی پیرۆز دیدێکی گەردوونی راست و دروست بۆ مرۆڤایەتی دەخاتەڕوو. خوای گەورە بەڕوونی خستویەتەڕوو کە هەموو مرۆڤەکان لە یەك گیان بەدیهێنراون. ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ **النساء: ١.**

واتە: (ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان کە ئێوەی لە تاکە کەسێك بەدیهێناوە، هەر لەوکەسەش هاوسەرەکەی بەدیهێناوەو پاشان لەنێوان هەردووکیاندا پیاوان و ئافرەتانی زۆری بەدیهێناوە، جا ئیتر ئێوە هەوڵبدەن خواناس و دیندارو پارێزکار بن بەرانبەر ئەو خوایەی کە بەناوهێنانی ئەو زاتە داوای ئەنجامدانی پێداویستیەکانتان لەیەکتر دەکەن، هەوڵبدەن پەیوەندی خزمایەتیش پتەو رابگرن، چونکە لەڕاستیدا خوای گەورە چاودێری هەموو کارو کردەوەکانتانە). ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴾ **الأنعام: ٩٨.**
واتە: (هەر ئەو زاتە ئێوەی لە تاکە نەفسێك بەدیهێناوە—کە باوکە ئادەمە، پاشان لەویش دایکە حەووای بەدیهێناوە ـ لەوەو دوا ماوەیەکی کورت لەپشتی باوکتاندا نیشتەجێبوون، دواتر گوازرانەوە بۆ نێوسکی دایکتان ـ لەنێو ملیۆنەها سەرەمێکوتەی زۆر وردا دانەیەك خۆی

گەیاندە هێلکۆکەو پێکهاتەیەکی سەرسوڕهێنەر لەنێو منداڵداندا دروستبوو ـ بۆ ماوەی چەند مانگێك مانەوە، پاشان بۆ ماوەیەك ژیانی ئێوەی لەسەر رووکاری زەوی دابینکرد، دوایی لەتوێیدا شارانەوە ـ تا رۆژی قیامەت ـ لەڕاستیدا ئێمە نیشانەو بەڵگەی زۆرمان بۆ باسکردوون بە تایبەت بۆ ئەوکەسانەی کە تێدەفکرن و لە نهێنیەکان تێدەگەن).

بەپێی دەقی قورئان هەموو مرۆڤەکان لە ئادەم و حەووان: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَـٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ **الحجرات:١٣**. واتە: (ئەی خەڵکینە ئێمە هەمووتانمان لە نێرومێیەك دروستکردووە، کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرەو هۆزی جیاواز تاپردی پەیوەندی لە نێوانتاندا دروست ببێت و یەکتر بناسن و هاوکاری یەکتر بن ، جا لەڕاستیدا بەڕێزترینتان لای خوای گەورە ئەوانەیە کە زیاتر خواناسن، زیاتر خۆیان لە حەرام و گوناهو خراپە دەپارێزن، زیاتر خزمەتگوزارن...هتد، دڵنیاش بن کە ئەو خوایە تەواو زانایە بەهەموو شتێك، تەواویش ئاگادارە لەهەموو شتێك، ئاگادارە لە ناخ و نیەتی تاکە تاکەی بەندەکانی لەهەموو کات و ساتێکدا).

وە تەواوی مرۆڤەکان لەبەردەم یاسای خوای گەورەدا یەکسانن و پرەنسیپی پارێزکاریی لای پەروەردگار تاکە پێوەرێکە کە مرۆڤێك لە مرۆڤێکیتر جیابکاتەوە، لەڕاستیشدا لاپەڕەیەك لە قورئاندا نیە هانمان نەدات لەسەر خۆڕازاندنەوە بە باوەڕو بە دادپەروەریی و چاکەکاریی و

ئازایەتیو ئارامگرتن و برایەتیو پاکیزەییو پایەدارییو توندوتۆڵیو جیددیەت. پێغەمبەری خوا ﷺ لەکۆتا گوتاریدا موسڵمانانی هانداوە لەسەر وەلاخستنی جیاوازی رەگەزیی، بۆی روونکردوونەتەوە کە هیچ جیاوازییەك لەنێوان رەگەزی عەرەبی و غەیرە عەرەبی یان رەش و سپیدا نیە مەگەر بە پارێزکاریی نەبێت، خوای پاکوبێگەرد هەڕەشە لە کەسە سەرپێچیکارو یاخیەکان لە فەرمانەکانی دەکات کە لێیان توڕەو عاجزە: ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُۖ وَمَن يَبۡخَلۡ فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦۚ وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُۚ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴾ **محمد: ٣٨.**

واتە: (بەڵام ئەوەتە ئێوە داوای بەخشینتان لێدەکرێت لەپێناوی ئایینی خوادا، کەچی هەتانە رەزیل و بەرچاوتەنگەو ئامادە نیە هیچ ببەخشێت، بەڵام چاك بزانن ئەوەی رەزیلی بکات، ئەوە بە زەرەری خۆی تەواو دەبێت، خوای گەورەش هەرخۆی دەوڵەمەندو بێنیازەو ئێوەن کە هەژارو نەدارن، جائەگەر ئێوە پشت بکەنە ئەم ئایین و بەرنامەیەو خەمی نەخۆن خوای گەورە پەکی ئایینی خۆی ناخات، بەڵکو ئێوە وەلادەنێت و کەسانێکیتری خەمخۆرو دیندار دێنێتە مەیدانەوە کە بەهیچ شێوەیەك لەئێوە نەچن و وەکو ئێوەش نەبن ـ لە کەمتەرخەمیو بێباکی و دنیاویستیو بێبەندو باریدا ـ ).

جارێکیان لەبارەی ئەو خەڵکانەوە کە لە وێنەی هاوەڵانی وان پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا، ئەویش ﷺ دەستی خستەسەر

شانی سەلمانی فارسیو گوتەیەکی فەرموو (بەم مانایە): ئەوانە قەومی ئەم پیاوەن، کە ئەگەر زانست لە کەشکەشانی فەلەك بێت دەستی پیاوانی وڵاتی فارسی پێدەگات.

خوای باڵادەست پێغەمبەری ﷺ رەوانەکردووە بۆ هەموو مرۆڤەکان، هەروەك ئایەتە قورئانیەکان کە دابەزێنرانە سەر پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەسەلمێنن کە بۆتەواوی مرۆڤایەتی هاتوون: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ **سبأ**: ٢٨.

واتە: (لەڕاستیدا ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە تۆمان رەوانەکردووە بۆ سەرجەم خەڵکی سەرزەوی لەهەموو سەردەمەکاندا تاکۆتایی دنیا، مژدە بەخشیت بە ئیمانداران و بێدارکەرەوەی بۆ هەموو مرۆڤەکان ـ تاکۆتایی دنیا ـ ، بەڵام زۆربەی خەڵکی دەرکی ئەم راستیە ناکەن و لێی تێناگەن).

قورئانی پیرۆزیش بیرخەرەوەیە بۆ هەمووی مرۆڤ، دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٌ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ **القلم: ٥٢**. واتە: (لەکاتێکدا قورئان تەنها پەیامی خواییە بۆ یادخستنەوەو بیرخستنەوەیە بۆ سەرجەم خەڵکی جیهان لەهەموو زەمان و زەمینێکدا ـ وە تۆ لەکەماڵی ژیریدایت و خاوەنی عەقلێکی دامەزراویت).

هەروەها ئاگادار کەرەوەیە بۆ هەمووی جیهانیان، دەفەرمویٚ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾ **الفرقان**: ١.

واتە: (هەرچی پیرۆزیی و شکۆمەندیی و موبارەکی هەیە بۆ ئەو زاتەیە

که کتێبی قورئان و جیاکەرەوەی حەق و ناحەقی نازڵکردووەتە سەر عەبدو بەندەی خۆی محمد ﷺ تا ببێتە هۆی بێدارکەرەوەو هۆشیارکەرەوەی سەرجەم خەڵکان ـ لە دەستەی جنۆکەو ئادەمیزادـ).

پێغەمبەریش رەحمەت و بەزەیی خوای گەورەیە بۆ تەواوی مرۆڤەکان، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧. واتە: (وە ئێمە تۆیشمان ئەی محمدﷺ رەوانەکردووە هەر بۆئەوەی ببیتە مایەی سۆزو میهرو رەحمەت بۆ سەرجەم خەڵکان و دروستکراوەکان ـ لەسەرزەوی خوادا تائاخر زەمان ـ). پەیامەکەشی ﷺ بۆ هەمووی خەڵکییە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ آل عمران: ٩٦.

واتە: (لەڕاستیدا یەکەم خانەو یەکەمماڵێك کە لەسەر زەویدا دانراو دیاریکرا بۆ خواپەرستی، ئەو ماڵەیە، ئەو کەعبەو خانووە پیرۆزەیە کە لە مەککەدایە، کە شوێنێکی موبارەك و پیرۆزەو هیدایەت و رێنمایی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی ئیماندار لەهەموو سەردەمەکاندا ـ نوێژێك لەو شوێنە پیرۆزەدا بەقەدەر سەد هەزار نوێژی شوێنانیتر خێری هەیە ـ ).

گومانی تێدانیە کە جیهانیبوونی قورئان کارێکی رەهایەو هیچ جۆرە هەڵاوێردکردنێکی تێدانیە، قورئانی پیرۆز بۆ موسڵمانانی روونیکردوەتەوە کە نابێ بڕواننە رەنگی پێست، یان نەژادو نەتەوە، یان رەگەزو داب و نەریتەکانی مرۆڤ.

لەڕاستیدا پابەندبوونی موسڵمانان بە قورئانەوە وایلێکردوون کۆمەڵگایەکی جیهانی بهێننە بوون کە تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگا یەکسانن لەنێوان خۆیاندا. جیهانی ئیسلامیش لە ئەمڕۆدا تێکەڵەیەکە لە جۆرەها رەگەزی مرۆییو زمان و کەلتووری جیاجیا، هەرئەوە لە کۆمەڵگای ئیسلامی دەخوێنرێتەوە کە دەبینرێ شارە گەورەکانی لەوەوە نزیکن هەموو جۆرە رەگەزێکی مرۆییان تێدابێت، ئەمانەش ژن و ژنخوازی لەنێوان خۆیاندا ئەنجام دەدەن و لەژێر ئاڵای جیهانیی ئیسلامیدا چوون یەك دەژین.

## بەرپرسێتی مرۆڤ

خوای گەورە مرۆڤی بە پاکیو بە بێتاوان بەدیهێناوە، هەر لە یەکەم ساتی لەدایکبوونیەوە ئامادەباشی تێدابووە ئاشنا ببێت بە کارە چاکەکان و بەها مرۆییەکان فەرهەم بێنێ. وە ئەگەر لە ئەنجامدانی فەرزە خواییەکاندا تەمبەڵی نواند ئەوا بڕوبیانووی لێ وەرناگیرێو قوبوڵ نیە، گومانیشی تێدانیە کە هەر مرۆڤێك بەجیا کۆمەڵێ لێهاتوویيو توانایی تێدایە کە جیاوازن لە لێهاتوویيو توانایی مرۆڤەکانیتر، بەڵام خوای گەورە بەڵێنی بە مرۆڤایەتی داوە کۆڵ و بارێك نەخاتە سەرشانی کە لەتوانایدا نیە، دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴾ البقرة: ٢٨٦. واتە: (لەڕاستیدا خوای

گەورە خواستی لەتوانا بەدەری نیەو ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسیٚ کە لە تواناو هێزی بەدەر بێت، با ئادەمیزاد چاك بزانێت هەر کارێکی چاك کە دەیکات قازانجی بۆخۆیەتی، هەر کارێکی خراپیش بکات ئەوە بە زیانی خۆی تەواو دەبێت و تەنها یەخەی خۆی دەگرێت ـ ئەگەر تەوبە فریای نەکەوێت ـ ).

سروشتی ژیانیش وەهایە کە مرۆڤەکان بەشێوازی جۆراوجۆر کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەیە، هەر تاکێکیش بەرپرسە لە کاروکردەوەی خۆی، گوناهو تاوانی کەسانیتر ناخرێتە ئەستۆیەوەو هەرچیدەکات بە چاك یان خراپ ئەنجامەکەی هەر دەگەڕێتەوە بۆ سەر خودی خۆی، خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ، وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ **النجم**: ٣٨ ـ ٣٩. واتە: ( ـ جا لەو کتێبە پیرۆزانەدا هاتووە ـ ، کە هیچ کەسێکی گوناهبار کۆڵی گوناهی کەسێکیتر هەڵناگرێت...،هەروەها هاتووە کە: ئادەمیزاد تەنها ئەوەی دەست دەکەوێت کە پێشتر دەستپێشکەری بۆ کردووە، چی چاندووە ئەوە دەدورێتەوە). ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴾ **الزمر**: ٤١. واتە: (لەڕاستیدا هەر ئێمە ئەم قورئانەمان نازڵکردووە بۆ تۆ لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی، جا ئەوەی ڕێبازی هیدایەت دەگرێت، ئەوە هەرخۆی سودمەند دەبێت، ئەوەش کە خۆی گومڕا دەکات ئەویش گومڕابوونەکەی لەسەر خۆی دەکەوێت، وە نەبێت تۆ بتوانیت

پاڵپێوەنەرو چاودێریان بیت ـ تا بەزۆر بیانخەیتە سەر رێبازی هیدایەت). ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ فصلت: ٤٦. واتە: (جا هەرکەس کاروکردەوەی چاکە بکات، ئەوا قازانجەکەی بۆ خۆیەتی، ئەوەش کە گوناهو خراپەو تاوان دەکات، ئەویش هەر لەسەر خۆی دەکەوێت، دڵنیابە کە پەروەردگاری تۆ —ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار ـ بچوکترین ستەم لە بەندەکانی ناکات).

لەم پێگەیەوە قورئانی پیرۆز بۆی روونکردوینەتەوە کە گوناهو تاوانی هیچ تاکێك ناخرێتە ئەستۆی کەسانیترەوە، هەروەك چۆن کردەوە چاکەکەی بۆ خۆیەتیو پاداشتەکەی لەبۆ کەسانیتر نیە، بەڵام بەرپرسێتی رەوشتیی، واتە ئەرکی مرۆڤ لە جێبەجێکردنی فەرمانە خواییەکاندا ئەوا دادەنرێن بە کارێکی تاککەسیو تایبەت، بەرپرسێتیش ئەوی راستی بێت خۆی لەخۆیدا کۆڵێکی قورسە لەسەر شانی ئادەمیزاد، جاوێڕای قورسی ئەو بەرپرسێتیە بەڵام هەر هەڵگرتنی دادەنرێ بە فەخرو شانازیو تایبەتمەندییەکی جیاکار بۆ مرۆڤ ، ئەو بەرپرسێتیە تاککەسیەش ئەوەندە پڕبەهایە کە شایانی ئەوەیە مرۆڤ لەپێناو هەڵگرتنیدا بچێتەژێر هەڵگرتنی جۆرەها مەترسیو گرفت و ئاستەنگەوە. چونکە دەتوانێ لەدووتویێو لەڕێگای ئەوەوە خۆی چارەنووسی خۆی دیاریبکات، ئەویش بە بەکارهێنانی ئەو تایبەتمەندییە کە تەنها خوای گەورە بەوی بەخشیوە. جائەگەر مرۆڤ توانی بەشێوەیەکی راست و دروست سودمەند بێت لەو تایبەتمەندییە جیاکارە

ئەوا لە ئایندەدا دەبێتە دروستکەری مێژوو و فەرمانڕەوا بەسەریەوە نەك ببێتە کەسێکی شوێنکەوتەو پاشکۆی مێژوو. وە ئەگەر مرۆڤ هەڵگری ئەو بەرپرسێتیە نەبووایە ئەوا شایانی ئەوە نەدەبوو ببێتە جێنشینی خوای گەورە لە زەویەکەیدا.

پوختەی قسەکەمان ئەمەیە کە مرۆڤ ئامێرێکی یاری پێکردن نیە (تەنانەت بە دەستی پەروەردگاریشەوە ـ بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز ـ) بە ئاستێکی وەها کە ئەگەر هەڵسوکەوتەکانی خۆی راپێچیانکرد بۆ سزایەکی هەتاهەتایی ئەوا ئەو پلەی مرۆڤبوونەی کە خوای گەورە پێیبەخشیوە هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. لەڕاستیشدا تاکە هۆکارێکیش کە بڕوبیانووی دەبڕێ لەوەی کە سزای هەتاهەتایی بچێژێ بریتیە لەو ئازادیەو تواناییەی کە پێیبەخشراوە، لەوەش گرنگتر ئەو بەرپرسێتیەی کە لەئەستۆیدایە. جائەگەر لێپێچینەوە لەسەر کردەوە نەبووایە ئەوا بەرپرسێتیەو پارێزکاریی و رەوشت دەبوونە شتێکی بێهودەو بێمانا، با ئەوەش بڵێین کە بەرپرسێتی وەها هاتووە کە لەمانای لێپرسینەوەوە نزیکە، چونکە بەبێ بوونی لێپرسینەوە ناکرێ بەرپرسێتی بوونی هەبێت، قورئانی پیرۆزیش چەندەها جار دووپاتیدەکاتەوە کە لێپێچینەوە لە مرۆڤ بوونی هەیەو حەتمییە. هەموو ئەم چەمکانەش هەر لە لێپرسینەوەو دادوەریەو رۆژی دوایی تا کۆتا سات و بەهەشت و دۆزەخ و پاداشت و سزا لەسەر لاپەڕکانی قورئان بوونیان هەیە.

خوای گەورە زاتێکی دادپەروەرە، هەموو یاساکانیشی دادپەروەرن، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ **النساء: ٤٠**. واتە: (خەڵکینە دڵنیابن کە خوای گەورە بەقەدەر تۆزقاڵێك ستەم لە هیچ کەس و هیچکام لە دروستکراوەکانی ناکات، بەڵام ئەگەر ئادەمیزادە خواناس و دیندارەکان چاکەیەك بکەن ئەوە خوای گەورە بەرەکەتی تێدەخات و پاداشتی چەند بەرابەر دەکات، پاشان لە قیامەتدا پاداشتی تایبەتی گەورەو بێسنوری خۆی دەبەخشێت بە چاکەخوازان). ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ ٱلنَّاسَ شَيۡـٔٗا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾ **یونس: ٤٤**. واتە: (بێکومان خوای گەورە بە هیچ شێوەیەك ستەم لە بەندەکانی ناکات، بەڵکو ئەو خەڵکە هەر خۆیانن کە ستەم لەخۆیان دەکەن و مافی یەکدی پێشێل دەکەن). ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴾ **الكهف: ٥٠**. واتە: (ئێمە پێشتر کاتی خۆی فەرمانماندا بە فریشتەکان و وتمان: ئادەی سوژدە ببەن بۆ ئادەم ـ مادام رەخنە دەگرن لەوەی کە زەوی بەنەوەکانی ئاوەدان دەکەمەوە ـ !!، ئەوانیش هەموویان دەستبەجێ، بێ دواکەوتن سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە لە پێڕی جنۆکە بوو سوژدەی نەبرد، یاخیبوو لە فەرمانی پەروەردگاری، باشە ئێوە ئیتر چۆن ئەو شەیتانەو

نەوەکانی دەکەنە دۆستی خۆتان و لەجیاتی من فەرمانبەرداری ئەو دەبن و فەرمانی من دەشکێنن، بە مەرجێ ئەوانە دوژمنی سوێنخواردووی ئێوەن، بەڕاستی ستەمکاران ناحەزێکی خراپیان کردووەتە مامۆستای خۆیان و بە فەرمانی دوژمنێکی ناپاك هەڵسوکەوت دەکەن).

دادپەروەریی خوایی دەخوازێ کە هیچ شتێك پشتگوێو پەراوێز نەخرێ با گەردیلەیەکیش بێت لە کارو کردەوەو نیەتی مرۆڤ، ئەو کردەوەو نیەتانەی مرۆڤیش لەڕۆژی قیامەتدا دەکەونەڕوو و نیشان دەدرێن و سەرئەنجام لەسەریان لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێ. ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ، وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ، وَقَالَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَا لَهَا ، يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ، بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ، يَوْمَئِـذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَـٰلَهُمْ ، فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴾ **الزلزلة: ١ ـ ٨.**

واتە: (ڕۆژێك دێت زەوی تەکانێکی گەورە دەخوات و لێك هەڵدەوەشێت، زەمین لەرزەیەکی سامناك سەرتاپای دەگرێتەوە. هەچی مادده سەنگینە تواوە گەرمەکانی ناخی هەیە هەمووی دەبنە گڕکان و دێنەدەرەوە. ئەو ئادەمیزادانەی کە ئەو ساتانە دەبینن و هەستی پێدەکەن، دەشڵەژێن و سەرگەردان دەبن و نازانن بەرەوکوێ ڕاکەن بۆیە بە شپرزییەوە دەڵێن: ئەوەچی قەوماوە، زەوی بۆ ڕادەکات، بۆ

ناسرەوێت!!. ئەو رۆژە ئیتر زەوی بەئاشکرا هەواڵی کۆتایی‌و ویرانبوونی خۆی رادەگەیەنێت و بەئاشکراو دڵنیاییەوە دەردەکەوێت کە پەروەردگاری تۆ ئەی ئینسان فەرمانی کۆتایی هێنانی دەرکردووە، تا دواتر بە شێوازێکیتر دروستیبکاتەوە. پاشان دوای ئەوەی بە شێوازی نوێ خوای گەورە زەوی دروست دەکاتەوەو سەرجەم مرۆڤەکان زیندوو دەکاتەوە، خەڵکی دەستە دەستە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە بە پەرش و بڵاوی راپێچ دەکرێن تا ئەو کاروکردەوانە کە لە ژیانی دنیادا ئەنجامیانداوە بە دەنگ و رەنگەوە ببیننەوە. جائەوەی بەقەدەر کەمتر لە گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجامدابێت، دەیبینێتەوە. ـ بە دەنگ و رەنگەوە ـ ، هەروەها ئەوەش کە بەقەدەر کەمتر لە گەردیلەیەك گوناهو خراپەی هەبێت، ئەویش بەهەمانشێوە دەیبینێتەوە.

(صعصعە)ی کوڕی (صوحان) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گوێبیستی ئەم سورەتە بوو ـ بەم مانایە ـ فەرمووی: ((ئەگەر لەدوای ئەم سورەتەوە ئیتر گوێبیستی هیچیتر لە قورئان نەبم ئەوا ئەم سورەتە بەسە بۆ ئامۆژگاری کردنم )). ﴿ ٱلْقَارِعَةُ ، مَا ٱلْقَارِعَةُ ، وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ، يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ،وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ، فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ، فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ، وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ، فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ، وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ، نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴾ **القارعة: ١ ـ ١١.**

واتە: ( ـ القارعة ـ یەکێکە لە ناوەکانی رۆژی قیامەت کە دەنگێکی سامناك و گرمەوناڵەیەکی بەهێز دەگەیەنێت کە دڵان دەلەرزێنێت و

دەیپچڕێنێت. ئاخۆ ـ القارعة ـ چی بێت؟! جاتۆ ئەی ئادەمیزاد چوزانی ـ قارعة ـ چییە؟!. ئەو رۆژە ئەوەندە سامناکە خەڵکی تیایدا وەکو پەپوولەی سەرگەردان پەرش و بڵاو دەبنەوە. کێوەکانیش وەکو خوری شیکراوەیان لێدێت، تەقینەوەو رەشەبای بەهێز هەڵدەکات و چاڵ و چۆڵی زەوی پڕدەبێتەوە...جادوای ئەوەی زەوی بەتەواوی شێوازی دەگۆڕێت و دەبێتە سەرزەمینێکی تەخت و ساف ئیتر ئادەمیزادەکان زیندوو دەکرێنەوە، ئەوەی ئەوکاتە تەرازووەکانی سەنگین بێت، کاروکردەوەی چاك و گوفتاری شیرینی زۆر بێت، ئەوە ئەوکەسە خوا دەیخاتە بەهەشتەوەو ژیانی لەوپەڕی شادیو کامەرانیدا دەباتەسەر، زۆر بەو ژیانەی رازیو خۆشنوودە. بەڵام ئەوەی تەرازووەکانی خێری سوك بێت و گوناهی زۆرو تاوانی بێسنور بێت، ئەوە دایکی ئەوکەسە — هاویة ـ و دۆزەخەو باوەشی بۆ گرتوەتەوە؟!. ـ هاویة ـ ئاگرێکی زۆر سوتێنەرو بەتین و بڵێسەدارە هەرگیز خامۆش نابێت و گڕوتینی کەم ناکات و لەکۆڵی نابێتەوە ـ دایك هۆکاری سرەوتن و حەوانەوەو ئارامگرتنە، بەڵام کاتێ کە ئەو ناوە لە دۆزەخ دەنرێت، واوەیلاو قوڕبەسەری بۆ نیشتەجێکانی دۆزەخە ـ).

دەکرێ دادپەروەریی خوایی (واتە لێپێچینەوە لە مرۆڤ) هەر لەم دنیایەشدا جێبەجێبکرێ، چونکە ویست و ئیرادەی خوای گەورە دەخوازێ کە مرۆڤی چاکەکار گەردیلەیەك لە تام و چێژی پاداشتی رۆژی دوایی لێرە بچێژێ، هاوکات دەخوازێ مرۆڤی گوناهکاریش گەردیلەیەك لە سزای رۆژی دوایی لە دنیایەدا بچێژێ، دەفەرموێ:

﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف: ٣٢.

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو خەڵکەی کە وادەزانن سودوەرگرتن و بەکارهێنانی نازو نیعمەتە جوانەکان حەرامن، بڵێ: باشە ئەوە کێ جورئەتی داوە بەخۆی کە ئەو زینەت و جوانیانەی خوای گەورە بەخشیویەتی بە بەندەکانیو بۆی بەدیهێناون، بە حەرام لەقەڵەمی دەدات،؟ ئەوە کێیە رزق و رۆزییە چاکەکان لەخۆی و لەخەڵکی حەرام دەکات...بەو خەڵکی بڵێ: هەموو ئەو نازو نیعمەتانە لە ژیانی دنیادا بۆ ئیماندارانیش حەڵاڵە، بەڵام لە قیامەتدا تایبەتە تەنها بە ئیمانداران، ئا بەوشێوەیە ئایەت و فەرمانەکان رووندەکەینەوە بۆ کەسانێك کە هۆشیاربن و لە رێنماییەکانی ئێمە تێبگەن).

وە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ **البقرة:** ٢٠١. واتە: (بەڵام کەسانێك هەن لەو خەڵکە ژیرە خواناسە کە بەدڵ و بەکوڵ دەڵێن: پەروەردگارا لە دنیادا خێرو چاکەو نازو نیعمەتمان پێببەخشە، لە قیامەتیشدا لە نازو نیعمەتی نەبڕاوەو پڕفەڕی بەهەشت بەهرەمەندمان بکەو لە ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە).

جا بە هەرحاڵ، مەعلومە کە جێبەجێکردنی سەراپای دادپەروەریی خوایی دواخراوە بۆ ئەو رۆژی قیامەتە کە مرۆڤ تیایدا دادوەریی دەکرێ، ئەوکات پادشتی خۆی لەسەر چاکەکانی وەردەگرێ وە یان بەپێی

کردەوەی خۆی سزا دەدرێ، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴾ **المؤمنون:** ١٦. واتە: (لەوەو دواو لەرۆژی قیامەتدا هەرهەمووتان زیندوو دەکرێنەوە ـ بۆ لێپرسینەوە، جا چاکەکان بە بەهەشت شاد دەبن و، ناپاکانیش لە دۆزەخ توند دەکرێن ـ ).

بە دڵنیایی کە جیهانی دوارۆژ ئەو جیهانەیە کە هەر مرۆڤێك پاداشت وەردەگرێ تیایدا وە یان سزادەدرێ ئەویش بەپێی ئەو کردەوەیەی کە کردوویەتی، جا لەپێناو راپەڕاندنی ئەو دادپەروەرییە رەهایە ئەوا قورئانی پیرۆز بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوەو جەخت لەسەرکردن روونیکردووەتەوە کە خوای گەورە تکاکاریی (الشفاعة) لە هیچ کەس وەرناگرێ مەگەر لەکەسێك نەبێت کە خوای گەورە خۆی مۆڵەتی دابێت بێتە گۆ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَـٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴾ **طه:** ١٠٩. واتە: (لەو رۆژەدا تکاو شەفاعەتی کەس وەرناگیرێت و سودی نابێت، مەگەر لە کەسێك کە خوای میهرەبان خۆی مۆڵەتی بدات و رازی بێت وتارێك پێشکەش بکات ـ کە یەکەم کەس تکای گەورە دەکات بۆ دەستپێکردن بە لێپرسینەوە بە وتارێکی جوان ئەوا پێغەمبەری خۆمانەﷺ).

پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی کۆچکردنی ئیبراهیمی کوڕیدا رایگەیاند کە مرۆڤ با تەنانەت کوڕی پێغەمبەریش بێت ئەوا هەر پێگەو پایەیەکی هەبێ لەڕۆژی قیامەتدا سودێکی پێناگەیەنێ.

# خۆشویستنی گشت مرۆڤایەتی

بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی چەندین ڕێچکەو ڕێبازی جۆراوجۆری پەیوەند بەمرۆڤەوە هاتوونەتەڕوو، هەوادارانیان وا ئیدیعا دەکەن گوایا ئەو ڕێبازانەیان تەباو گونجاون لەگەڵ خۆشویستنی مرۆڤەکاندا، پەیڕەوکارانی تەواوی ڕێچکەکان هەوڵیانداوە بیسەلمێنن ئەو ڕێبازەیان کە بەرگری لێدەکەن پلەو کەسایەتی مرۆڤ بەرز دەکاتەوەو دەیگەیەنێتە ئاستێکی تایبەت، یان لە جیهانی بووندا ڕۆڵێکی پاك و باڵای پێدەبەخشێ یان رابەرایەتی دەکات بەرەو چارەنووسێکی پرشنگدار.

جا هەرچەندە زیادەڕۆیی لە ئیدیعای ئەو ڕێبازانەدا هەیەو هەریەکەیان وا خۆی دەنوێنێ گوایا جیهانگیرو گشتگیرەو سەراپای مرۆڤایەتی (لە ڕواڵەتدا) دەگرێتەوە، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە ئەوەی کە دەیلێن باری تەواوی مرۆڤەکان ناگرێتەوە، جگە لەوەش هەر لە بنەڕەتدا بۆ زامنکردنی سودمەندیی مرۆڤەکان دانەڕێژراوە، بەڵکو لەو پێناوەدا دانراوە کە تەرخان بکرێ لەسەر گەیاندنی سودمەندیی بەو رەگەزەی کە بە ئامانجی گرتووەو بۆ بەرژەوەندی کەلتوورەکەی دەکۆشێ، خراپترینی ئەو ڕێبازانەش ڕێبازی دەمارگیریی جولەکەیە. ئەم ڕێبازە ئیدیعا دەکات گوایا جولەکە کوڕانی خوان و تاکە رەگەزێکن کە نزیکن لەوەوە، یان بە دەستەواژەیەکی تر بڵێین ئەم ڕێبازە دەڵێ تەنانەت ئەگەر جولەکە سەرپێچی فەرمانی خوا بکەن و جۆرەها هەڵەو

تاوان ئەنجامبدەن و شوێن خواکانی تریش بکەون (بەپێی گوزارشتی پێغەمبەرەکەیان) (HOSEAH) ئەوا هەر کوڕانی خۆشەویستن لای خوای گەورە، خوایش (بە شێوەیەکی زۆرەملێو تۆپزی) فەزڵی داون بەسەر سەراپای تاکەکانی مرۆڤدا.

ئگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان باوەڕی بوزیو ئایینی مەسیحیو تیۆری نوێی نکولیکار لە ئایین لەلایەك و لەنێوان ئیسلامدا لەلایەکیترەوە ئەوا زۆر بەڕۆشنی بۆمان روونده‌بێتەوە کە ئایینی ئیسلامی پیرۆز تاکە بەرگریکاری راستەقینەیە لە تەواوی مرۆڤایەتی، هەر ئیسلام رێنماکاریەتی بۆ بردنی بەرەو بەختەوەری لە دنیاو قیامەتدا.

بەڵام باوەڕی بوزا دەڵێ لەڕاستیدا ژیانی مرۆڤ جگە لە ماندوبوون و زەحمەت و بەدبەختی شتێکیتری تێدانیە، هەر خاڵێکی پرشنگداریش کە تێیدایە تراویلکەیەکەو هۆکارێکە بۆ نەهامەتیو ئێش و ئازارێکی زۆر، لەبەرئەوە باوەڕی بوزا باوەڕی بە جیهانی نادیار (غیب)و میتافیزیکی نیە، هەموو هەوڵێکی لەپێناو سوککردنی نەهامەتیو ئێش و ئازاری مرۆڤەکانە، ئەگەرچی باوەڕیشی وایە کە ناتوانرێ بە تەواوەتی زاڵبوون دەستەبەر ببێ بەسەر ئەو دەردیسەری و ئێش و ئازارانەو لەناو ببرێن، کەواتە ئەو کامڵییەی کە دەخوازرێ و دەویسترێ تەنها لە مردنی جەستەی مرۆڤدا خۆی دەبینێتەوە. تەنها لەم حاڵەتەشدا ـ بە بۆچوونی باوەڕی بوزییەکان ـ ئێش و ئازارو زەحمەتیەکان بوونیان نامێنێ. جا بۆ گەیشتن بەم حاڵەتە ـ بەپێی باوەڕی بوزی ـ رێگا

چارەیەکیتر نیەو هەردەبێ بەرگەی ئازارەکان بگیریت و دوورەپەرێزی لە شانۆی ژیان بێتەدی.

گەورەترین کەموکوورِیەو کەلێن لە باوەڕی بوزا دا بریتیە لە جەختکردنی لەسەر بوونی لانەوازەییو بەدبەختی مرۆڤ، وەك وەها بێت کە ژیانی مرۆڤ و بونەوەر جگە لەوە کە لانەوازەییو بەدبەختییە شتێکیتر نیە، لەبەرئەوە ئەم رێبازە بانگەشە دەکات بۆ بەرگەگرتنی ئازارەکان و کارکردنیش پشتگوێ بخرێ بۆ حەزی دەروون بە تەنها ،بەمشێوەیە وا لە شوێنکەوتووانی دەکات کە کەسانێکی دواکەوتوو بن لە رووداوەکانی مێژوو، هەروەها هەرجۆرە هەوڵێك بۆ ریکردن بەرەو کاروانی کەلتوریی‌و ژیاریی کارێکی بێهودەیە، بەپێی چەمکی ئەم باوەڕە هەرکەس دەیەوێت لەم ژیانە رزگاری ببێ ئەوا پێویستە لەسەری بەرگەی ئازارو سەختی و ئاستەنگەکان بگرێ، لێرەوە دەبێ توانایەکی گەورەی بەرگەگرتنی هەبێ، بۆیە دەبێ لە هەژاریی‌و بێبەشبووندا بژی‌و خۆی لەکاروباری خەڵکانیتر هەڵنەقورتێنێ، بەڵکو تەنها بیر لەوە بکاتەوە کە چۆن ئازارو بەدبەختی لەخودی خۆی دووربخاتەوە. لەم دیدەوە (دیدی باوەڕی بوزی) ئیتر مەسەلەکە رۆشنە کە ژیانی مرۆڤ ـچ بۆ خۆی یان بۆ کەسانیتریش بێت ـ دادەنرێ بە شتێکی بێسودو بێ کەڵك و بێمانا.

(مەسیحیەتی دەستکاریکراوو گۆڕدراو)یش ئەو بۆچوون و داواکارییەی رێبازی بوزی دەربارەی چییەتی‌و راستێتی (ماهیة) ژیانی لاپەسەندە، ئەوەندە هەیە زیادەیەکی خستوەتەسەرو دەڵێ ئەو تاوان و

لادان و داڕوخانانه لەژیانی مرۆڤدا شتێکی حەتمین و بەهەمان رێژەی ئەو ئازارو تەنگوچەڵەمانەن کە دێنە رێگای. مەعلومە کە باوەڕی بوزی ئازارەکان و نەهامەتیەکان بە کارێکی خراپ دادەنێت و بەوەیان دانانێ کە پەیوەستن بە مرۆڤەوە، بەڵام مەسیحیەت باوەڕی وایە ئەو ئازارو تەنگوچەڵەمانەی کە تووشی مرۆڤ دەبن لەبەرئەنجامی گەندەڵیو یاخیبوونی مرۆڤ خۆیەوە تووشی دەبن.

(مەسیحیەتی دەستکاریکراوو گۆڕدراو) (هەروەك باول تیلیج دەڵێ): خوای گەورە زانیاری هەیە بە تاوانەکانی لەوەوپاشی ئەو مرۆڤە کە دەیەوێت دروستیبکات ، لەبەرئەوە ئەوا هەڵەو لادان و گوناهە خودییەکان مرۆڤ پیس دەکەن بەرلەوەی لە دایك ببێت.

ئەگەر بێین ئەم پرسیارە ئاڕاستەی پەیڕەوکارانی ئەم تیۆرە بکەین و لێیان بپرسین: ئایا لەسەر چ بناغەو بنەمایەك ئەم تیۆرە زیادەڕۆییەتان دانراوە؟ ئەوا وەڵامیان بەمجۆرەیە: مادامێ خوای گەورە کوڕەکەیی رەوانە کردووە تا لە خاچ بدرێ، ئەویش ـ واتە عیسا ـ چووەتە ژێر بەرپرسێتی هیدایەتدانی خەڵکی، کەواتە هەبوونی تاوان لە خودی مرۆڤدا زەروورییەو دەبێ ببێ، بەڵام ئەگەر ئەو حاڵەتە وەها نەبووایە ئەوا داستانی خوایی پێویستی نەدەکردو لەو حاڵەتەشدا عیسا لە ئاستی پیاوێکی دانا، یان پێغەمبەرێك (تا ئەوپەڕی سنور) دەبوو نەك وەها بێ خوا بچێتە سەرشێوەی عیسا.

هەر ئەو (مەسیحیەتە دەستکاریکراوە) وا ئیدیعا دەکات کە خوای گەورە خۆی لەسەرشێوەی عیسا خستوەتەڕوو ئەو حاڵەتەش بۆ

بەسوك سەیركردنی مرۆڤە چونكە گوناهكارە، بەڵام ـ لەناكاودا ـ پایەی بەجۆرێ بەرزدەكرێتەوە بگەیەنرێتە پلەی هاوەڵێتی خوا، وە دەڵێت كە مرۆڤ بەدیهێنراوێكەو قورسایی خۆی هەیەو شان و شەوكەت دارە، بەجۆرێ كە خوای پاكوبێگەرد نەیتوانیوە لە حاڵەتی فەوتاندا بیبینێ، لەبەرئەوە خوا(الله) لەسەرشێوەی مرۆڤ خۆی دەرخست تا داستانی رزگاركردنی مرۆڤ بێنێتە بوون.

ئەوی راستی بێت مەسیحیەت بەم ئیدیعایەی ئەوەمان پێدەڵێ كە مۆڵەتی بە مرۆڤ داوە تا بە لەخۆبایی بوونێكی زیادڕەوانە لەخۆبیایی ببێ، چونكە وا ئیدیعا دەكات كە خوا(الله) خۆی لەپێناو ئەم هەبووە كردووەتە قوربانی!.

ئەوەش بەڕوونی دەردەكەوێ كە ئەو ئیدیعایەی(مەسیحیەتی دەستكاریكراو) بانگەشەیەكی درۆیەو لەبەرئەنجامی نەفامییەوە سەرچاوە دەگرێ.

(مەسیحیەتی دەستكاریكراو) هاوڕایەو تەبایە لەگەڵ باوەڕی بوزیدا كە ئیقرار بە كلۆڵیو نەگبەتی مرۆڤ دەكات، بەڵام مەسیحیەت ئەو كلۆڵیو نەگبەتیە دەگێڕێتەوە بۆ گوناهی خودی مرۆڤ یان هۆكاری بایۆلۆژی. جا بۆئەوەی مرۆڤ لەم بارودۆخە ناهەموارە دەربچێ ئەوا بە دەستی خۆی چیرۆكێكی تری داهێناوە كە دەڵێ خوای گەورە چووەتە سەرشێوەی مرۆڤ، لەپێناو مرۆڤیشدا خۆی كردووەتە قوربانی، پاشتر سەرلەنوێ زیندووی كردووەتەوە. بەڕاستی ئەم بیروبۆچونانەو ئەم

چیرۆکانە بە زیادەڕۆو توندڕەوو درۆ دادەنرێن و تەواو پێچەوانەن لەگەڵ ڕاستیدا.

گومانی تێدانیە کە پەیبردنی ڕاست و دروست بە چییەتی و ڕاستێتی (ماهیة) هەڵەی مرۆڤ، دڵنیایی دەدات کە تەواوی ئەو درۆیانەی کە دراونەتە پاڵ خواو پەیوەندن بە مرۆڤەوە پووچەڵدەکاتەوە، ئەم بیرو بۆچوونە گەوج و زیادەڕۆییانە سودێکیان بۆ مرۆڤ تێدانیە، هەروەها ئەو هزرو یاسا دەستکردانەو نا لۆژیکیانەی کڵێسا، وە ئەو مامەڵە سەختەی کە لەلایەن قەشەکانەوە پەیڕەو دەکرا، وایانکرد کە ژیانی مرۆڤایەتی تووشی لەقبوون و پشێوی ببێتەوە هاوکات ڕێگیریی لێبکەن لەوەی بگات بە ڕاستێتیو بە بەختەوەریی.

جائەگەر رابەرو پێشەوا یەکەمەکانی مەسیحیەت دانیان بە ڕاستیەکاندا بنایە، پێناسەو ئاشناییان هەبووایە بە کردەوە چاك و خراپەکان و ڕوونیان بکردنایەتەوە ئەوا ناچار نەدەبوون ڕوو لە درۆکردن بکەن و بەڵگەو یاسای ناڕاست دوور لە ڕاستی بهێننەوە.

هەموو ئەو بانگەشە درۆینانەو هێنانەوەی بەڵگە هەڵانەو هەڵسوکەوتە ساختەکاریانەی کە پیاوانی ئایینی مەسیحی ئەنجامیاندا سەریان کێشا بۆ دەرکەوتنی تیۆری (ڕەتکردنەوەی ئایینی مەسیحی).

بەڵام باوەڕبوونیان و خۆشویستنیان بۆ گوتەی ساختە کە لەلایان سەری هەڵداو زیاد لەوەش ئەو دەمارگیریەی کە لە بیروهۆشیاندا هێلانەی کردبوو ڕێگای پێنەدان (مەسیحیەتی دەستکاریکراو) بە تەواوەتی ڕەتبکەنەوە، لەبەرئەوە ڕۆشنبیران هەوڵیاندا بێن تیۆری

رزگارکردنی مرۆڤ لە کلێساو لە بەها ئایینیەکان دابڕێژن بەجۆرێ کە گونجاو بێت لەگەڵ تەماعبازی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپیدا ئەویش بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئاسیاو ئەفەریقیا، ئەم تیۆرەش تێکەڵەیەکی لێکەوتەوە کە ئاوێتەبوو لە دەمارگیریی‌و خۆشویستنی خود. ئەم بارودۆخەش بووە مایەی دەرکەتنی پشێوی نانەوە لە ئازادی‌و دیموکراسیدا. ئەو پەرچە کردارەی کە لە روسیا دژ بە کلێسا هاتەگۆڕێ توندترو سەختتر بوو لە هەر شوێنێکیتر، بەجۆرێ کە هزری ماددەگەرایی جێگای هزری کلێسای گرتەوە، کە سەرئەنجام ئەم بیروباوەڕە بڵاوبوویەوە کە دەڵێ: کۆتا ئامانج لەم جیهانەدا دەستەبەرکردنی خۆشگەزەرانییە بۆ چینی کرێکار.

تیۆری مارکسی دەڵێ مرۆڤ هەبوویەکی بەرهەمهێنەرو وەبەربەرەو تەواوی پێداویستیەکانی لە چوارچێوەی لەزەتە ماددیەکانی ژیاندان.

تیۆری رزگارکردنی مرۆڤیش وێڕای ئەو هەموو بانگەشە قەبانەی کە هەڵیگرتبوون هەر بۆئەوە هات تا بە شێوازێ پشێوی بنێتەوە، مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێت کە بارودۆخەکە تایبەت بێت بە گروپێکی نەژادییەوە یان دەوڵەتێکەوە کە پێویست نەکات پشێوی تێدا بنرێتەوە. ئەم شێوازەش لە پراکتیزەکردنی ئەو تیۆرەدا کە ناونراوە بە (ئازادی مرۆڤ) لە هەموو شێوازەکانیتر باوترو بڵاوترە.

حاڵی ئەم رێچکەو رێبازانە هاوشێوەی رێچکەو رێبازە نیشتمانی‌و نەتەوەییەکانن کە کەڵك و سودەکەیان تەرخانەو قەتیسکراوە لە توێژێکی تایبەتدا. لە بەرانبەر ئەمەوە ئەوا ئەو تاك یان کۆمەڵ و

گەلانەی کە لەلایەن پەیڕەوکارانی ئەم ڕێبازانەوە ژێردەستە دەخرێن هەموو مافە مرۆییەکانیان دەفەوتێن و لەدەستیان دەچێ. ئەگەر دەربارەی ناوەڕۆکی ئەو ڕێبازانەوە قسەیەك هەبێ ئەوا دەبێ بوترێ کە لە سنوری لەزەتە ماددیەکان تێناپەڕن، هەریەك لەو ڕۆشنبیرانەی کە بەرگری لەو ڕێبازانە دەکەن وەك: جرمی بنتام، جان ستیوارت میل، برتراند رسل، لویس بری، وە جۆن دیوی نەیانتوانیوە بە وەڵامێکی گومانبڕو یەکلاکەرەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە کە دەڵێ: ئایا مرۆڤ بۆچی ناچار دەکرێ بچێت بۆلای پزیشکی ددان؟، ئەی ئیتر دەبێ چۆن چۆنی وەڵامی ویژدانی ئەو مرۆڤە بدەنەوە کە بە دەنگی بەرز هاوار دەکات و دەڵێ هەرچەندە لەزەت هەر لەزەتە بەڵام دەکرێ دژ بێت لەگەڵ ڕەوشت و پێچەوانە بێت لەگەڵیدا.

لەبەرانبەر هەموو ئەمانەوە تیۆری مرۆڤایەتی ئیسلام دادەنرێ بە تیۆرێکی سەد دەر سەد جیهانی و سەراپای خەڵکی دەگرێتەوە. ئەوەی کە ئیسلام لە موسڵمانانی داوا دەکات هیچ جیاواز نیە لەگەڵ ئەو خواستەی کە لە خەڵکانیتری دەوێ، هەروەها ئیسلام مرۆڤ وەها دادەنێ ئەو بەدیهێنراوەیە کە لەسەر جوانترین شێوە دروستکراوەو هەڵگری ئاستێکی گەورەیە لە پەیپێبردن و ئامادەسازی کە لەتوانایدا بێت لەگەڵ کات و شوێندا ڕێبکات و خۆی بگونجێنێو ئەو گۆڕانکاریانە بێنێتەدی کە خوازراون لێی، لێرەوە (ئیسلام) دەیکاتە ئەرکی مرۆڤ کە دەبێ هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی خۆی ڕەچاو بکات و بەرەوپێشیان ببات وەك: ڕەهەندی فیزۆلۆجی، ڕەهەندی کۆمەڵایەتی، ڕەهەندی

رۆشنبیری، رەهەندی زانستی، رەهەندی مەعنەوی، وە رەهەندی رۆحی خۆی هەمووی چوون یەك، ئەمەش ئەوە دەگەیەنیٚ کە ئیسلام ریٚز لە دەستکەوتەکانی ژیانی خەلٚکی دەگریٚت و دەیاننرخیٚنیٚو کاردەکات بۆ گەشە پیٚدانیان و زیادکردنی بەهای گشت جیهان.

ئایینی ئیسلام بە هیچ جۆر هیچ هیٚزیٚك لە هیٚزەکان بەوە دانانیٚ کە هیٚزی خراپە بیٚ، بەلاٚم ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ پیٚیان هەلٚدەستیٚو پیٚچەوانەی فەرمانەکانی خوای گەورەن بە کردەوەی نزم و سوك و ریسوا ناوزەدیان دەکات، هەروەها دان دەنیٚ بە بوونی کردەوەی خراپ بەلاٚم حالٚەتی رەهاییان پیٚنادات، بەهەمانشیٚوە ئیقرار بە بوونی کردەوەی چاك دەکات بەلاٚم حالٚەتی رەهایی بەمانیش نابەخشیٚ.

ئایینی ئیسلام بەڕوونی دەلٚیٚ هەر دواکەوتنیٚکی مرۆڤ لە جیٚبەجیٚکردنی فەرمانە خواییەکان یان لە هەرکاریٚکی چاك ئەوا سەرئەنجام لەلایەن خوای گەورەوە لیٚپرسینەوەی لیٚدەکریٚ، پاداشتی لەسەر وەردەگریٚ یان بەپیٚی کردەوەکانی سزا دەدریٚت، هەروەها مرۆڤ بەو چاوە سەیردەکات کە لە فریشتەکان چاکترە چونکە پردیٚکە لەنیٚوان خوای گەورەو میٚژوودا.

بە دلٚنییایەوە کە مرۆڤ بالاٚترینی بەدیهیٚنراوەکانە، وە دادەنریٚ بە تاجی بەدیهیٚنراوەکان و ویٚنای جوانی ئەوانیش دەکات، بەلاٚم لە ژیٚر رکیٚفی دەستەلاٚت و ویستی خوای گەورەدایەو هیچ هیٚزو توانایەکی نیە لەبەرانبەر ئیرادەی ئەو زاتەوە.

ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە مەعلومە کە پەروەردگاری بالآدەست دوژمنی مرۆڤ نیە، بەوەشی دانانێ کە ناحەزی ئەو بێت، ئایینی ئیسلام تەواوی مرۆڤەکان  ئیتر موسڵمان بن یان یان غەیرە موسڵمان بەو چاوە سەیردەکات کە بەدیهێنراوی خوای گەورەن و سەرئەنجام بەپێی دادپەروەریی خوایی لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ، هیچ مرۆڤێکیش لە مرۆڤێکیتر چاکتر نیە.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی ڕۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

ـ فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و ڕوونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

ـ گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و ڕۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

ـ چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها ڕۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

ـ بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

- هاوكاريى هەوڵ و كۆششى زانا توێژەرەوەكانى زانكۆ و بنكەكانى توێژینەوەی زانستیی و بڵاوكردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەكان.

- ئاڕاستەكردنى توێژینەوە زانستى و ئەكادیمییەكان لەپێناو خزمەتكردن بە فیكر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێكى لە پایتەختى وڵاتە عەرەبى و ئیسلامییەكان و وڵاتانى تریش هەیە، كە لە ڕێگەیانەوە كار و چالاكییە جۆراوجۆرەكانى خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێكەوتننامەیەكى لەگەڵ ژمارەیەك زانكۆی عەرەبى و ئیسلامیى و خۆرئاوایى لە سەرانسەرى جیهاندا بۆ هاوكاریى زانستى هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

- بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

- خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

- هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.